زنجیرەی ئیسلام و زانست

1

# قورئان و زەویناسی

قورئان و زانست

2


ئامادەکردنی

سەروەر حەسەن

پێداچوونەوەی زانستی

دکتۆر فوئاد محمد قادر



التفسير

زنجیرەی قورئان و زانست (٢)

# قورئان و زەویناسی

ئامادەکردنی

سەروەر حەسەن

پێداچوونەوەی زانستی

د.فؤاد محمد قادر

پسپۆڕ لە جیۆلۆجیای نەوت

پێداچوونەوەی زمانەوانی

م.ناهیدە ڕەحمان

بەکالۆریۆسی زمانی کوردی



ناوی کتێب بەکوردی: قورئان و زەویناسی
ئامادەکردنی: سەروەر حەسەن
پێداچونەوەی زانستی: د.فؤاد محمد قادر
پێداچونەوەی زمانەوانی: م.ناهیدە ڕەحمان
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٣٢٠ ) ساڵی ٢٠١١ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دلدگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# ناوەرۆك


پێشەکی ........................................ ٩
پێکهاتەی گشتی زەوی ........................ ١١
زەوی و جیاوازیی خاکەکەی........................ ١٢
لەجوڵە وەستانی زەوی ........................ ١٤
هێزی کێشکردنی زەوی ........................ ١٦
پشتێنەی موگناتیسی ........................ ١٨
قۆناغەکانی دەرکەوتنی مانگ ........................ ٢٠
ڕووناکیدانەوەی مانگ و تیشکی خۆر........................ ٢١
سوڕانەوەی زەوی........................ ٢٤
پەستانی هەوا........................ ٢٧
شێوەی زەوی گۆیی تەواو نییە........................ ٣٠
لەرینەوەکانی دەنکۆڵە خۆڵییەکان ........................ ٣٢
گەردەلول و ئاگر........................ ٣٤
مانای زمانەوانی گێژەڵوکە (إعصار):........................ ٣٥
جۆرەکانی (با) لە قورئانی پیرۆزدا........................ ٣٧
داماڵینی ڕووناکی ڕۆژ ........................ ٤٠
بیردۆزی ڕێژەیی........................ ٤١
نەبینینی ئەو تەنانەی بەخێرایی زیاد لەخێرایی
ڕووناکی دەجوڵێن........................ ٤٣
ئەندازەگیری لە بەدیهێنانی زەویدا........................ ٤٤
مێژووی شەو و ڕۆژ........................ ٤٧
سوودەکانی شەو و ڕۆژ........................ ٥٠
هەناسە دەدات........................ ٥٣
نزمترین ناوچە لەسەر ڕوی زەوی ........................ ٥٧

درز و کەلێنی زەوی ........................ ٥٩
خۆرهەڵات و خۆرئاواکان ........................ ٦٠
جیاوازی ساڵی هەتاوی و ساڵی مانگی ........................ ٦٢
زەوی زەلیل و ملکەچە ........................ ٦٣
شاخەکان و باران بارین ........................ ٦٥
کرداری داماڵین شاخەکانی بۆ تەختانی و دەشت گۆڕیوە ........................ ٦٧
پێشبینی قورئانی پیرۆز بە هۆکارەکانی گەیاندن ........................ ٦٨
پێشبینیکردنی قورئانی پیرۆز بەهۆکارەنوێیەکانی گواستنەوە ........................ ٦٩
گەشەکردنی هۆکانی گواستنەوە ........................ ٧٠
کانزا و ناکانزاکان ........................ ٧٥
کانزا و ناکانزاکان لە قورئانی پیرۆزدا ........................ ٧٦
دارشتە کانزاییە پتەوەکان ........................ ٧٨
لەدەستدانی نەرمونیانی کانزاکان ........................ ٧٩
نیشتمانی خامی توخمەکان ........................ ٨٠
ئەوەی لەژێر خاکدا هەیە ........................ ٨٢
دەرچوونی قورساییەکانی زەوی ........................ ٨٣
کانزای ئاسن ........................ ٨٥
پێکهاتەی کیمیایی بەرد و مرۆڤ ........................ ٨٨
شاخەکان ........................ ٩٠
شاخ لە زانستی زەویناسیدا ........................ ٩١
ئاماژە جیاوازەکانی قورئانی پیرۆز بە شاخ (الجبل) ........................ ٩٢
یەکەم: خاسیەتی مێخێتی شاخەکان ........................ ٩٤
مێژووی دروستبوونی بیرۆکەی بوونی ڕەگی شاخەکان ........................ ٩٥
چەمکی زانستی خاسیەتی مێخێتی شاخەکان ........................ ٩٧
دووەم: چەسپاندن و لەنگەرپێگرتنی زەوی یان
شاخەکان لەسەر زەوی ........................ ١٠٢

سێیەم: بوونی هێڵ و نەخشەی ڕەنگ جیاواز
لەسەر شاخەکان.................................. ١٠٩
(جُدَد)ی بەردین لەزانستی زەویناسیدا ........................ ١١٠
پێشینەی قورئان لە ئاماژەدان بە ڕەنگەکانی (جُدد)
بە ڕەنگی سپی و سوور و ڕەش.................................. ١١٢
ئاو و کاریگەریی لەسەر ڕەنگی شاخەکان .................... ١١٤
چوارەم: جوڵەی شاخەکان شوێنکەوتەی جوڵەی زەوییە ....... ١١٧
ئاو و دەریا و باران .......................... ١١٩
ئاو بنەڕەتی ژیانە .................................. ١٢٠
بنەڕەتی مرۆڤ ئاوە: .................................. ١٢١
بنەڕەتی ڕووەك ئاوە: .................................. ١٢٢
سوڕی ئاو لە سروشتدا .................................. ١٢٤
بنەڕەتی ڕووبار و سەرچاوەکان و چۆنیەتی باسکردنی
ئەم بابەتە لە قورئاندا: .................................. ١٢٥
گەرمی و هەڵم.................................. ١٢٧
هەورەقورسەکان .................................. ١٢٨
بارانی شیرین.................................. ١٢٩
دابەزاندنی باران بە ئەندازەی دیاریکراو.................................. ١٣٠
یەکەم: خێرایی دابەزین .................................. ١٣٠
دووەم: بڕی بەهەڵمبوو و بڕی باران .................................. ١٣١
چینەکانی بینین لە قوڵایی دەریادا .................................. ١٣٢
نهێنی هەورەکان .................................. ١٣٤
دیاردەکانی دەریا .................................. ١٣٥
سێ جۆر شەپۆلی دەریاکان هەن:.................................. ١٣٦
دەریای گەرمکراو .................................. ١٣٩
نهێنی هەڵقوڵینی ئاو لەبەردەوە ! .................................. ١٤٠

ئاوی ژێر زەوی........................ ١٤١
ناوچەی ڕێژگە و بەربەستی نێوان دوو دەریا .................... ١٤٢
ناوچەی ڕێژگە (پێکگەیشتنی ئاوی دوو دەریا): ................ ١٤٣
بەربەستی نێوان دوو دەریاکە: ............................ ١٤٥
(با) و شەپۆلەکانی دەریا............................ ١٤٨
ترس و باران ........................................ ١٥١
سەرچاوەکان ........................................ ١٥٥

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

بەقەڵەمی د. فؤاد محمد قادر
پسپۆڕ لەبواری نەوت، زانکۆی سلێمانی

قورئانی پیرۆز پەیامێکی بەردەوامی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی، مرۆڤەکان دەدوێنێت بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوویان پێکەوە گرێ دەدات، حیوار لەگەڵ مرۆڤ دەکات وەك بەشێك لە جیهانێکی گەورەتر، سەرنجی بۆ بوونەوەرێك (گەردوون)ی پان و بەرینی چواردەوری ڕادەکێشێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾، هانی دەدات بیربکاتەوە و ژیریی بخاتەگەڕ، قسە لەگەڵ ناخ و ئەقڵ و ویژدانی مرۆڤەکاندا دەکات... ئایەتەکانی قورئان پڕاوپڕن لە ئاماژەی زانستی و مەنتیقی، لە کات و شوێنی گونجاودا ئاماژە بۆ دروستکراوەکان و دیاردە سروشتییەکان دەکات، بەجۆرێك کە مرۆڤەکان لە هەر بڕگەیەکی مێژوودا بن، لەهەر ئاستێکی زانستیدا بن، کاتێك شرۆڤەی ئەو ئاماژە قورئانیانە دەکەن دەبینن پڕاوپڕ پێکاویەتی و زانست بەتەواوی لەگەڵیدا هاوتەریبە.

کتێبی (قورئان و زەویناسی) کە برای بەڕێزمان کاك "سەروەر حەسەن" ئامادەی کردووە، هەوڵێکی باشە بۆ خستنەڕوو و شرۆڤەکردنی

ئەو ئایەتە پیرۆزانەی ئاماژە بە زەوی دەکەن، لە ڕووەکانی: شێوەی دەرەوەی زەوی و پێکهاتەی چینەکانیەوە، پێکهاتەی شاخەکان، کانزا و بەردەکان، بەرگەهەوای دەوری گۆی زەوی و سوڕی ئاو لە باران و ڕووبار و دەریاکان.

دەستخۆشی لێدەکەم، خوای گەورە پاداشتی ماندووبوونی بداتەوە، هیوادارم من و خوێنەرانی تریش بە دڵی پڕ لە ئیمان و بیری پڕ لە زانستەوە بچینە خزمەت ئایەتەکانی قورئان و بە تێڕامانی قووڵەوە بیخوێنینەوە تا زیاتر و زیاتر گەورەیی ئەم پەیامەمان بۆ دەربکەوێت و هەڵزنێین بە بالآی بەرزی ئەم قورئانەدا، تا لە سایەیدا گەشە بکەین و بەرزبینــــــەوە ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾... دووبــــــارە دەستخۆشی بۆ کاک سەروەر.

# زەوی و جیاوازیی خاکەکەی

بێگومان خاکی زەوی هاوچەشن نییە و لە یەك جۆر نییە، هەروەها لە تاکە توخمێکیش پێکنەهاتووە... قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەم وتەیە دەدوێت و دەفەرموێت: ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِي ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾الرعد/٤، واتە: لەسەر ڕووکاری زەوی پارچەی جۆراوجۆر هەیە لەپاڵ یەکدا (کە کاریگەرییان لەسەر چۆنیەتی و بەرهەمی ڕووەك هەیە، جگە لەوەی جیاوازیان نیشانەن بۆ کانزا جۆراوجۆرەکان)، هەروەها لە ڕەزی ترێ، کشتوکاڵی هەمەجۆر لە دانەوێڵە و بێستانەکاندا، دارخورمای یەك قەد و دوو قەد، هەموو ئەمانە بە یەك ئاو ئاودێر دەکرێن و لە یەك جۆر ئاو دەخۆنەوە (بەڵام سەرەنجام ئەو هەموو بەروبوومە جیاوازە لە قەبارە و تام و بۆن و ڕەنگ و شێوازدا، پەیدا دەبن) و هەندێکیانمان لە هەندێکی تر بۆ خۆراکی مرۆڤ نازدارتر و پەسەندتر کردووە، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك ئەقڵ و ژیری خۆیان بخەنە کار.

لەم دوادواییانەدا زاناکان گەیشتنە ئەو ڕاستییەی توێکڵی زەوی کە بە فاکتەرەکانی داماڵین (تعرية) تێکشکاو و پەرت بووە و وایلێهاتووە ڕەگەزەکانی یەك نەگرن، بەڵکو هەر خاڵێك سروشت و تایبەتمەندی خۆیی وەرگرتووە.

ئەوەش ئەو مانا زانستییەیە کە ئایەتەکە ئاماژەی پێدەدات، هەر پارچە زەوییەك لە چەند بەشێکی هاوسێی پێکەوەلکاو پێکدێت، هەرچەندە لە پێکهاتەی ئەو بەشانەدا ماددەی کانزایی یان ئەندامیی یاخود بەکتری جیاواز هەن... کاتێك ئاودێری بەشێکی دیاریکراوی زەوی دەکرێت، دەبینیت بەروبوومەکانی هەمەچەشنن، چونکە بەشگەلی قوڕین و هی تری لمین یاخود کلسی هەیە، لەگەڵ ئەوەش کە بە یەك ئاو ئاودێری دەکرێن کەچی بەروبوومەکانیان جیاوازە.

ئایا هەر ئەم زانیارییە نییە ئایەتە قورئانیەکە ئاماژەی پێدەدات؟ ئاخۆ محمد (ﷺ) ئەم زانیاییەی لەکوێوە هێناوە؟ بەدڵنیاییەوە نیگای خوای مەزنە...

# لەجوڵە وەستانی زەوی

زەوی لــە جوڵەیــەکی یەکبینــە و بەردەوامدایــە، بــەڵام لــە هەنــدێك ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا ئــەو ڕاستییە دەخوێنینــەوە کــە لــە وەستانی سوڕانەوەی زەوی یاخود وەستانی جوڵەکەیەوە چی ڕوودەدات؟

خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾القصص/٧١-٧٢، واتــە: (ئــەی محمد (ﷺ)) بڵێ: خەڵکینە هــەواڵم بدەنێ ئەگــەر خــوا شــەوگار بکات بــە هەمیشەیی تا ڕۆژی قیامەت (هەر ڕۆژ نەبێتەوە) چ خوایەکی تر هەیە جگــە لە (الله) بتوانێت ڕووناکیتان بۆ فەراهەم بهێنێت، ئایا ئێوە ئــەم ڕاستییانە نابیستن؟ هەروەها پێیان بڵێ: هــەواڵم بــدەنێ ئەگــەر خــوا ڕۆژگاری کــردە هەمیشەیی لەسەرتان، تا ڕۆژی قیامەتی خایانــد، کــام خــوا هەیــە جگــە لــە (الله) شەوگارتان بۆ پێش بێنێت، تا ئارامیی تێدا بگرن، ئایا ئێوە ســەرنجی ئەم دیاردانە نادەن و نایانبینن؟!

زانایان ئاشکرایان کردووە زەوی خولێك بــەدەوری خۆیــدا بــەماوەی (٢٤ کاتژمێر) تەواو دەکات، ئەگــەر هاتوو خێرایی ســوڕانەوەی بــەدەوری خۆیــدا بە بڕی ( ١چرکە) کەم بکات لەماوەی تێپەڕبوونی (١٢٠ هەزار ساڵ)دا، ئەوا

سوڕانەوەی زەوی لەدوای (٤٣٢ ملیۆن ساڵ) بە ئەندازەی یەك كاتژمێر كەم دەكات.

لەو كاتەدا كۆی كاتەكانی شەو و ڕۆژێك دەبێتە (٢٥ كاتژمێر)... وردە وردە كەمبوونی بەردەوام دەبێت و بەوەش ماوەی شەو و ڕۆژ درێژتر دەبێت، بەم پێیە هەر دەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان زەوی لە جوڵە بوەستێت.

چی دەبێت ئەگەر زەوی لە سوڕانەوەی بەدەوری خۆیدا وەستا؟ ئەو كاتە ئەو نیوەیەی گۆی زەوی كە بەرامبەرە بە خۆر دەبێتە ڕۆژێكی بەردەوام و نیوەكەی تریش دەبێتە شەوێكی هەمیشەیی.

بەدیهێنەری بەتوانا لەو ئایەتەی پێشوودا پرسیارێك دەخاتەڕوو بۆ تێڕامان و بیركردنەوە و گەڕان، بۆ دەرخستنی توانایی زاتی (الله) لە بەدواییەكداهێنانی شەو و ڕۆژ.

خۆئەگەر زەوی لەجوڵە وەستا، ئەو دەمە:

ڕووی بەرامبەر بە خۆر هەمیشە ڕۆژ دەبێت!

ڕووەكەی تری زەوی دەبێتە شەوێكی هەمیشەیی!

هەر ئەو زانیارییەیە كە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا تۆماری كردووە!

# هێزی کێشکردنی زەوی

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا﴾المرسلات/٢٥-٢٦، واتـە: ئایا ئێمـە زەویمـان نـەکردووە بـە هۆکـاری کۆکردنەوە، بۆ زیندوان و مردوان؟

ئایەتەکە ڕوون و ئاشکرایە لـە بـورای سوپاسـکردن و وەیادخسـتنەوەی بەخششدا: ئایائەم زەوییەی لەسەری دەژین وەهامان لێنـەکردووە بـەکێش بێـت بۆتـان، بەڕادەیـەك کـە هـەموو هۆکارەکـانی ئـارامی و دڵنیـایی و جێگیربوونتانی لەسەر دەبیننەوە؟ بۆئەوەی کەس وەها خەیاڵ نەکات ئـەم کێشکردن و گردکردنەوەیە تەنها بۆ ئەوکاتەیە کە مرۆڤ لەدوای مردنی لەنێو زەویدا دەنێژرێت، ئەو ڕستەیەی لە ئایەتەکەدا هاتووە ﴿أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا﴾ واتە بەجۆرێکمان لێکـردووە کێشـتان بکـات، جـا بـە زینـدوویی بەسـەریدا بـڕۆن یاخود بە مردوویی تیایدا بنێژرێن.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا﴾النمـل/٦١، واتـە: (ئایا تەنها ئەو زاتە نییە) کە زەوی دامەزراندووە؟

ئەم ئایەتە ئامـاژە بـە کێشـکردنی زەوی دەدات کـە بەهۆیـەوە شـتەکان لەسەر زەوی جێگیر و چەسپاون و بەوەش ژیان ئیمکانیەتی هەیە، گەر ئەو سیفەتی کێشکردنەی زەوی نەبوایە ژیان ئەستەم دەبوو.

ئیســحاق نیــوتن (١٦٤٢ز-١٧٢٧ز) یاســای کێشــکردنی گشــتی دانــا: (هەموو دوو تەنێك لە گەردووندا بە هێزێك یەکتری کێش دەکەن، بڕی ئەو هێــزە زیاددەکــات بــە زیــادبوونی لێکــدانی بارســتایی دوو تەنەکــە و کەمبوونەوەی دووریی نێوانیان (بە دووجا)).

ئەم بیردۆزە بووە زانستێکی هەستپێکراو کە بەهۆیەوە هەسارەکان دەخولێنەوە. لەوانەش خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا کە تیایدا خۆر هێزی کێشکردنی بۆ سەر زەوی هەیە و هەر بەهۆی ئەو هێزەوە (لەگەڵ بەردەوامیی جوڵەی زەوی) ئەو کارە بەئاکام دەگات.

هەر زانست دەڵێت: ئەگەر ئەو هێزی کێشکردنە نەبێت، مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی بەرزدەبێتــەوە (دەفڕێــت)، هــەروەك ســەر هەنــدێك لــە هەسارەکانی تر کە هێزی کێشکردن کەمترە.

ئایا ئەو بەدیهێنانە مەزن و وردەکارییە سەرنجڕاکێشە شوێنەواری ڕێکەوتە؟!

# پشتێنەی موگناتیسی

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴾الأنبياء/٣٢، واتـە: ئێمـە ئاسمانمـان كـردووە بـە سـەقفێكی پارێزراو، كەچی ئەوانە ڕوویان وەرگێڕاوە لەو هەموو نیشانە و بەڵگانـە (ی بەسەریانەوەیە).

لەسـاڵی (١٩٥٨ز) دا بـەهۆی مـانگی دەسـتكردی (Explorer 1) ـەوە زانسـت دۆزییـەوە كـە بەرگەهـەوای زەوی بـە هـەر پێـنج بـەش و حـەوت چینەكەیەوە، لـە تیشـكی گـەردوونی و بـای خـۆریی كوشـندە پـارێزراوە بەهۆی پشتێنەی (ڤان ئەلن)ەوە كە (١٠٠–١٥٠ هەزار كیلۆمەتر) لە ئاسـتی ڕووی دەریاوە بەرزە و بـۆ مـاوەی پـانی (٧٥٠٠ كیلۆمـەتر) درێژدەبێتـەوە. ئەم پشتێنەیە قەڵغانێكی پارێزەر دروستدەكات كە زەوی و بەرگەهەواكەی دەپارێزێت.

كـاری ئـەم قەڵغانـە لـە بـواری موگناتیسـی زەوییـەوە هـاتووە كـە پارێزگاریكردنە لە زەوی و بەرگەهەواكەی لە تیشـكی گـەردوونی هـاتوو لـە ئەستێرەكان و بەتایبەتیش لە تیشكی بـا خۆرییـەكان كـە خێراییەكـەی بـە نزیكەیی دەگاتە تێكڕایـی (١,٥ ملیـۆن كیلۆمـەتر) لـە هـەر كاتژمێرێكدا... خۆئەگەر ئەم بوارە موگناتیسیەی زەوی نەبوایە كە زەوی و بەرگەهەواكەی دەپارێزێت، تیشكی گاما و تیشكی ئێكس و تیشكی ئەلفا و بەشـێكی زۆری

تیشکی ژێرسوور زیندەوەرانی سەر زەوی تووشی لەناوچوون دەکرد و ژیان لەسەر زەوی نەدەما.

ئەگەر مانـای وشـەی (السـماء) کورتبکەینـەوە لـەوەدا کـە بەرگەهـەوای زەوییە، ئەمەی باسـکرا دەبێتـە ڕووی زانسـتی ئـەو ئایەتـەی دەفـەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴾الأنبيـــاء/٣٢... بەڵام ئەگەر لـە مانـای وشـەی (السـماء) وەهـا تێگەیشـتین کـە بریتییـە لـە هەموو ئەوەی لە سـەرروومانەوەیە، واتـە گـەردوون و ئـەوەی تێیدایـە، ئـەوا هەموو شتێك لە گەردووندا پارێزراوە بەهۆی ئەو یاسا وردانەی پـەروەردگار بـۆی دانـاون کـە گەلەسـتێرە و ئەسـتێرە و هەسـارەکانی بـە بەرزییـەوە ڕاگرتووە و ڕێگای گرتووە لەوەی ئاسمان بکەوێتە خوارەوە و ئاسمانـەکان و زەوی تێبکچـن و لەیـەك بترازێـن، تـەنها بـە فـەرمانی زاتـی پـەروەردگار نەبێت.

لەلایەکی ترەوە دەبێت ئەوەش بوترێت کە ئایەتەکە مانایەکی فراوانتری تێدایـە لـە (پشـتێنەی موگناتیسـی زەوی)، دەشـێت سـەرجەم چینەکانی بەرگەهەوا بگرێتەوە لە چینی ئایۆنی و چینی ئـۆزۆن و... جگـە لەوانـەش، کە هەریەکەیان جۆرە قەڵغانێکی پارێزەرن بۆ زەوی.

# قۆناغەکانی دەرکەوتنی مانگ

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴾یس/٣٩، واتە: کات و شوێنی هەڵهاتنی مانگمان دیاریکردووە، هـەتا سەرەنجام وەك چیلکەیەکی وشکی باریك دەنوێنێت.

ڕاڤـەکارانی قورئـانی پـیرۆز دەڵـێن: "خـوای گـەورە کـات و شـوێنی هـەڵهاتنی مـانگی دیـاریکردووە، لـە شـەوی یەکـەمی مانگـدا بـە کـزی و ڕووناکییەکی کەمەوە هەڵدێت، پاشـان لـە شـەوی دووەمـدا ڕووناکییەکـەی زیاددەکات و شوێنەکەشی بەرزتر دەبێتـەوە، چـەند بەرزبێتـەوە هێنـدەش ڕووناکییەکـەی زیاددەکـات تـاکو لـە شـەوی چـواردەدا دەگاتـە ئەوپـەڕی ڕووناکی خـۆی. لـەدوای ئـەم حاڵەتەشـەوە دەسـتدەکات بـە کـەمکردن تـا کۆتاهەمین شەوی مانگ کە تیایدا وەك چیلکەیەکی وشکی باریکی لێدێت".

زانست دەڵێت: "شێوازە جیاواز و قۆناغبەندییـەکانی مـانگ کـە لەسـەر زەوییەوە دەبینرێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئـەوەی خـۆر بـە بـەردەوامی نیـوەی مـانگ ڕوونـاك دەکاتـەوە و نیوەکـەی تـری تاریکـە. ڕووە ڕووناکەکـەی بەردەوام ڕووی لە خۆرە و لە کۆتایی مانگیشدا مانگ لەنێوان ئێمە و خۆردا دەبێـت، ڕووە ڕووناکەکـەی بەرامبـەر بـە خـۆرە و ڕووە تاریکەکـەی بـەرەو ئێمەیە، بۆیە نایبینین. لەدواییدا دەستدەکات بە بەرزبوونەوە و ئیتر کەمێك لە بەشە ڕووناکەکە دەبینین، واتە یەك شـەوە (هـیلال) دەبینرێـت. پاشـان

که مانگ زیاتر بـەرزبووەوە ئەوکاتـە بەشـە نیـوە ڕووناکەکـەی دەبینرێت، کاتێکیش مانگ بە (چوارده شەوە) ی دەبینین ئەوکاتە زەوی لەنێوان خۆر و مانگدایـە. ڕووە ڕووناکەکـەی بەرامبەرمانـە و تاریکەکەشـی لـە پشـتەوە، بەمجۆرە ڕووە تاریکەکە پێچەوانەی ئێمەیە.

# ڕووناکیدانەوەی مانگ و تیشکی خۆر

زانایانی گەردووننـاسی دەڵێن مانگ لە سەرەتای بـەدیهێنانی گەردوونـدا وەك خـۆر ڕووناکیـدەر بـووە و لەبەرئـەوەی کـە بەرگەهـەوای زەوی بەمشێوەیەی ئێستای نەبووە، بۆیە زۆر بـە ئاسـانی ڕێـداوە بـە گەیشـتنی ڕووناکی خۆر و ڕووناکی مانگ و ئەستێرەکان بۆ سەر ڕووی زەوی بـە شـەو و بە ڕۆژ. هەر لەبەرئەوەیە زەوی تەنها ڕۆژی هەبووە و شەوی نەبووە. هەر لەو سەرەتایەوە ڕووناکی چەندان ملیۆن لە شوهب و نەیزەکەکان بەر ڕووی زەوی دەکـەوتن تـاکو ویسـتی خـوا وابـوو ڕووناکی مـانگ کوژایـەوە و ئەستێرەکانیش تاریك بوون بەهۆی بڵاوبوونەوەی تۆزی گەردوونییـەوە کـە تائێسـتاش بـە دەوری ئەسـتێرەکاندا هـەن. هـەروەها ویسـتی خـوایی بـوو بەرگێکی هەوایی بـۆ زەوی بـەدیبێهێنێت کـە ڕۆژانـە زەوی لـە پێداکـەوتنی چەندین ملیۆن شوهب دەپارێزێت، بە ڕۆژ و بە شەویش.

ئـەوەی زیـاتر کڵپەسـەندوبوونی مـانگ دەسـەلمێنێت، ئـەو شـوێنەوارە کۆنانەن کـە لەسـەر ڕووی مـانگ بینـراون، شـوێنەواری ئـەو گڕکانانـەی لـە ڕووەکەیەوە بەهۆی گەرمییـە زۆرەکەیـەوە دەرچـوون، ئـەو گەرمییـە تـاکو

ئێستاش لە ناواخنی مانگدا شاردراوەتەوە تاکو وەك شاهیدێك بێت لەسەر بەزەیی خوایی بەرامبەر بە مرۆڤ.

لـە "ئـیبن عـەباس"ەوە گێڕراوەتـەوە کـە فەرموویـەتی: "مـانگ کڵپەسەندوو بووە و خوا ڕووناکیەکەیی کوژاندووەتـەوە". "ئیبن عـەباس" ئەم وتەیەی لە ڕاڤەی ئایەتی ﴿فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ﴾دا وتووە. لەو ئایەتەی کە دەقەکـــەی بەمشـــێوەیەیە: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا﴾الإسراء/١٢، واتـە: ئێمـە دیاردەی شـەو و ڕۆژمان کردووە بە دوو بەڵگە و نیشانە، ئێمـە تاریکیمـان بەسـەر دیاردەی شەودا هێناوە و دیاردەی ڕۆژیشمان بە ئاشکرا و دیار و بینـراو سازاندووە، تا لە ناز و نیعمـەتی پـەروەردگارتان بـەهرەوەر بن، تـا ژمارەی ساڵەکان بـزانن و حسـاب ڕابگـرن، بەڕاسـتی ئێمـە هـەموو شـتێکمان بـە فراوانـی و بەربڵاوی ڕوونکردووەتەوە.

نیشـانە و ئایـەتی شـەو (دیـاردەی شـەو) مانگـە، خـوای گـەورە ڕووناکیدانەوەی کوژاندووەتەوە و تاریکی کردووە. ئایەتی ڕۆژیش بریتییە لە خۆر کە خوای گەورە وای بۆ داناوە ڕووناکیدەر و چرایەکی ڕۆشـن بێـت کە کۆمەڵە سوودێکی لە ژمارە نەهاتووی هەیە.

مانگ لەدوای کوژانەوەی بەشێوەیەکی لێهات کە ئیتر خۆی ڕووناکی بەرهەم نەهێنێت، بەڵکو ڕووناکی خۆری دەکەوێتە سەر و پاشان بەشێوەی نـوور دەیداتـەوە... نـوور ئـەو ڕووناکیەیـە کـە لـە تەنێکـەوە پێچـەوانە دەبێتـەوە و لـە خـودی ئـەو تەنـەدا دروسـت نابێـت، بـەڵام تیشـکدان

(ڕووناكیـدان) ئەوەیـە كـە لـە خـودی تەنەكـەوە دروسـت دەبێـت و بـۆ دەورووبەری بلأودەكاتەوە (وەك لە خۆردا).

لەپێشدا باوەڕ وابوو كە مـانگ لـە حـاڵی ئێسـتایدا هـەر خـۆی ڕووناكی دەدات، بەلأم بە پلەیەكی كەمتر لە خۆر. بە بیری كەس لەوانـەدا نـەهاتووە ڕووناكی مانگ كوژێنراوەتەوە و نوورەكەی لە خۆرەوە پێچەوانە دەكاتەوە. ئەمە و مەسەلەی باسكردنی نووری مـانگ و ڕووناكیـدانی خـۆر یەكێكـە لـە ئیعجازەكـانی قورئـانی پـیرۆز... لـە سـەرجەمی ئـەو باسـانەی دەربـارەی بابەتی ڕووناككردنەوەن هەواڵی ئـەوە دراوە كـە مـانگ نووربەخشـە، بـەلأم خۆر ڕووناكیدەرە. هەندێك لەو دەقانەش ئەمانەن:

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾

الفرقـان/٦١، واتـە: زۆر گەورە و مەزنە ئەو زاتەی لـە ئاسمانەكانـدا هەسـارە و ئەسـتێرەی گـەورە گـەورەی بـەدیهێناوە، هـەروەها چـرایەكی پرشـنگدار و مانگێكی ڕووناكیش (كە نووربەخشە).

﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا ﴾یونس/٥، واتە: خوا هـەر ئـەو زاتەیە كە خۆری كردووە بە سەرچاوەی پرشنگدار و مانگیشـی كـردووە بـە سەرچاوەی نوور.

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴾نوح/١٥-١٦، واتە: ئایا ئەوە نابینن كە چۆن خـوا حـەوت چـین ئاسمـانی دروسـتكردووە؟ مانگیشـی كردووەتـە هـۆی ڕووناكی و نـوور و خۆریشی داگیرساندووە.

# سوڕانەوەی زەوی

قورئانی پیرۆز هەواڵیداوە کە زەوی بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە و شێوەکەیشــی نیمچــە گۆییــە، لــە وەســـفێکی جـــوان و وێنـــاکردنێکی سەرنجڕاکێشدا، ئەویش بە باسکردنی بەرەنجامی ئـەم سوڕانەوەیە، وەك دەفــەرموێت: ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾الأعـراف/٥٤، واتــە: شــەو ڕۆژ دادەپۆشێت و بـەخێرایی عەوداڵـە بەدوایدا. یان دەفـەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْـلَ فِى ٱلنَّهَـارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَـارَ فِى ٱلَّيْـلِ﴾الحج/٦١، واتە: خوای گـەورە زاتێکـە کـە شـەو تێهەڵکێشـی ڕۆژ دەکـات و ڕۆژ تێهەڵکێشـی شـەو دەکـات. هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَـارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ﴾الزمــر/٥، واتــە: ئاسمانـــەکان و زەوی لەسەر بنچینەی هــەق و ڕاستی دامەزراندووە، بەشێوەی کەوانـەیی شـەو بەسـەر ڕۆژدا دێنێـت و بەهـەمان شێوەی کەوانـەیی ڕۆژیش بەسـەر شەودا دێنێت.

ئەو سێ ئایەتـە پـیرۆزەی پێشـوو سـوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆیـدا دووپاتدەکەنــەوە کــە لــە ئەنجامیــدا شــەو وڕۆژ پەیــدا دەبــن، چـونکە لـە ئەنجامی سوڕانەوەیدا نیوەی گۆی زەوی جارێك ڕووبەڕووی خـۆر دەبێـت و جارێکیش ڕووبـەڕووی تـاریکی گـەردوون، کاتێـك نیـوەی ڕووبـەڕووی خـۆر دەبێت ڕووناکی بەردەکـەوێت و ئەمـەش واتـە لـە ڕۆژدایـە. هـەر لەمکاتـەدا

نیوەکەی تـری گۆی زەوی لـە تاریکیدایـە واتـە لـە شـەودایە. بەمشێوەیە حاڵەتەکـە دووبـارە دەبێتـەوە، ئەمـەش بـە سـوڕانەوەی زەوی دەبێـت بـە دەوری خۆیدا کـە ڕووی زەوی تـاریکی و ڕووناکی بەدواییەکداهاتووی بـە بەردەوامی و بەخێراییەکی زۆر دەبێت، وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا﴾ واتە: هەریەکەیان ئەوی تر دادەپۆشێت، ڕۆژ شـەو دادەپۆشـێت و شـەویش ڕۆژ دادەپۆشـێت، ئەمـەش مانـای وایـە تـاریکی شوێنی ڕۆژ دەگرێتەوە و دەبێتە شەو، هەروەك چۆن ڕووناکی شوێنی شەو دەگرێتەوە و دەبێت بە ڕۆژ.

پـــــەروەردگار دەفـــــەرموێت: ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾الحدید/٦... مانای (یولج) واتە چـوونی شـتێك بـەناو شـتێکی تـردا یـان تێهـەڵکێش کـردن، بۆیـە پـەروەردگار شـەو تێهەڵکێشـی ڕۆژ دەکـات و ڕۆژ تێهەڵکێشـی شـەو دەکـات. تـاریکی دەچێتە شـوێنی ڕوونـاکی وەك چۆن ڕووناکی دەچێتە شوێنی تاریکی، هەردووکیان (تاریکی و ڕووناکی) بـەهۆی سوڕانەوەی خێرای (زەوی) بەدەوری خۆیدا شوێنیان دەگۆڕن.

هەروەها یەکێکی تر لەو ئایەتە پیرۆزانەی ئاماژە بـە سـوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا دەکات، ئـەو ئایەتەیـە کـە دەفـەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيۡفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ وَلَوۡ شَآءَ لَجَعَلَهُۥ سَاكِنٗا ثُمَّ جَعَلۡنَا ٱلشَّمۡسَ عَلَيۡهِ دَلِيلٗا﴾الفرقـــان/٤٥، واتــە: ئایـا نابینیـت چـۆن پـەروەردگارت سـێبەر درێژدەکاتـەوە، خـۆری کردووە بەهۆی گۆڕانکاری لە سێبەردا؟

خوای مەزن ڕووناکی خۆری وەك بەڵگەیـەك دانـاوە لەسـەر سـوڕانەوەی زەوی، بۆیـە دەبیـنین سـێبەر (تـاریکی) لـە خۆرهەڵاتـەوە بـۆ خۆرئـاوا

درێژدەبێتەوە، پاشان لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەلآت، درێژدەبێت و پاشان کورت دەبێتەوە و دواتر درێژ دەبێت، چونکە زەوی دەسوڕێتەوە. خۆئەگەر زەوی لە سوڕانەوەی بەدەوری تەوەرەکەیدا ڕاوەستا، ئەوا سێبەریش لە درێژبوونەوە دەوەستێت و جێگیر دەبێت، چونکە جولەی سێبەر تەنها بەهۆی جولەی زەوییەوە دەبێت. خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾النمل/٨٨، واتە: تۆ کێوەکان دەبینیت وادەزانیت وەستاون و بێ جولەن، لەکاتێکدا ئەوانیش وەکو هەور لە جولەدان، ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی هەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە، ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

"حەنەفی ئەحمەد" دەڵێت: "(جامدة) بە مانای وەستاو و جێگیر دێت، (مرّ)یش بە مانای ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوە دێت، بۆیە مانای ئایەتەکە بەمجۆرەی لێدێت: دەڕوانیتە شاخەکان و تۆیش کە لەسەر زەویت وا هەست دەکەیت وەستاوە و ناجوڵێت، بەلآم لە ڕاستیدا شاخ و هەورەکانیش پێکەوە دەڕۆن و لەجولەدان و دووردەکەونەوە، بەوەش کە شاخەکان بەشێکن لە زەوی و جێگیرن لەسەری، بۆیە ئایەتەکە بە ڕاشکاوی باس لەوە دەکات زەوی و ئەوەش لەسەریەتی لە شاخەکان لەگەڵ هەورەکان و هەوای سەریدا دەجولێن و دووردەکەونەوە، واتە زەوی لە بۆشاییدا بە خێرایی دەگوێزرێتەوە".

ئەم ئایەتە پیرۆزە دڵنیایی ئەوەمان دەداتێ کە زەوی دەڕوات و لە شوێنی خۆی دەگوێزرێتەوە، ئەم جولە و ڕۆیشتن و گوێزانەوەیەی زەویش لە خولگەی تایبەتیدایە بەدەوری خۆردا.

بەوپێیەی ئێمە هەست بە جوڵەی زەوی ناکەین وا دادەنێین شاخەکان وەستاو و جێگیرن، هەروەك چۆن ئەو زەوییەش کە لەژێر پێیەکانماندایە و لەسەری دەژین وا دادەنێین ئەویش جێگیر و وەستاوە، کەچی لە ڕاستیدا بەخێراییەکی زۆر بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە. هەروەها هەرگیز ئەو جوڵەیەش هەست پێناکەین کە زەوی بەدەوری خۆردا بەخێراییەکی گەورە دەسوڕێتەوە، هەرچەندە ئێمەی مرۆڤ لەسەریشی دەژین.

## پەستانی هەوا

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ﴾ الأنعام/١٢٥، واتە: ئەوەی خوا بیەوێت هیدایەتی بدات سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەوەش کە بیەوێت گومڕای بکات، دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەکات، هەروەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرزبێتەوە.

لەم ئایەتەدا بەڕوونی و ئاشکرایی تەواوەوە ئامـاژە بـە دوو ڕاستی دەدات کە زانستیش لەوەودوا دۆزییەوە و دانی پێدانا:

یەکەم: گۆڕانی گەورە لە پەستانی هەوادا لەکاتی بەرزبوونەوەی خێرا لە ئاسماندا ڕوودەدات، بۆ مرۆڤیش دەبێتەهۆی سنگ تەنگبوون و ناڕەحەتی لە هەناسەداندا.

دووەم: چەند لە ئاسماندا بەرزبینەوە پەستانی هەوا دادەبەزێت و بڕی ئۆکسجین کەم دەکات.

لەسـاڵی (١٦٤٨ز) زانـای نـاودار "بلیـز باسـکاڵ" سـەلماندی بـە بەرزبوونـەوە لـە ئاسـتی ڕووی دەریـاوە پەسـتانی هـەوا کەمـدەکات. لـە ئینسایکلۆپیدیای جیهانیشدا هاتووە: بارستەی مـەزنی هـەوا بەشێوەیەکی یەکسـان بـە ئاڕاسـتەی سـتوونی دابـەش نـەبووە. بەڕادەیـەك کـە (٥٠٪)ی بارسـتایی هـەوای کـەش لـەنێوان ڕووی زەوی و بـەرزی (٢٠ هـەزار پـێ) لەسەروو ڕووی دەریادایە. (٩٠٪)ی لەنێوان ڕووی زەوی و بەرزی (٥٠ هەزار پێ)یە لەڕووی زەوییەوە. بەمجۆرە چڕیی هەوا بـەپێی بەرزبوونـەوەمان بـە ستوونی بۆ سەرەوە بەخێرایی کەمدەکات، تاکو دەگەینـە بەرزییـەکی زۆر، ئیتر چڕیی هەوا دەگاتە بڕێکی زۆر کەم.

هەر لەهەمان سەرچـاوەدا هـاتووە: سـەرجەم بـەدیهێنراوە زینـدووەکان پێویستیان بە ئۆکسجین هەیە، جگە لە زینـدەوەرە پێکهاتـە سـادەکان کـە تەنها لە یەك خانە پێکهـاتوون... بۆنموونـە مـرۆڤ پێویسـتی بـە وەرگرتنـی ئۆکسجینی هـەوا هەیـە لـە هەناسـەدانیدا تـاکو بـە زینـدوویی بمێنێتـەوە و پارێزگـاری لـە ئاسـتی دیـاریکراوی پەسـتان بکـات. بۆیـە بـوونی مـرۆڤ لـە بەرزایی کەمتر لـە (١٠ هـەزار پـێ) لەسـەروو ئاسـتی دەریـاوە نابێتـە هـۆی دروستبوونی گرفتێکی ئەوتۆ بـۆ هەناسـەدان، لـە بـەرزایی (١٠ هـەزار– ٢٥ هەزار پێ) شدا، هەناسەدان هەر شیاو دەبێت، بەشێوەیەك کـە کۆئەنـدامی هەناسـەدانی مـرۆڤ دەتوانێـت خـۆی لەگەڵـدا ڕابهێنێـت، بـەڵام زۆر بـە ناڕەحەتی و ئەستەم... لـە بـەرزایی (٢٥ هـەزار پـێ) ئیتر مـرۆڤ ناتوانێت بەهیچ شێوەیەك هەناسە بدات، ئەوەش دەبێتـەهۆی مـردن بـەهۆی کـەمیی ئۆکسجینەوە.

لـە ئینسـایکلۆپیدیای ئەمریکیـدا هـاتووە: پێویسـتە فڕۆکـە، ئەگـەر لـە بەرزاییەکی زۆردا بوو، پارێزگاری لە ئاستی دیاریکراوی پەستانی ناوەوەی بکات بۆ پارێزگاری سەرنشینەکانی، چونکە پەستانی هەوا لەو بەرزاییانـەدا زۆر کەمتر دەبێت لە بڕی گونجاوی دەستەبەرکردنی ئۆکسجینی پێویست بۆ مانەوەی سەرنشینەکان لە ژیاندا. هـەروەها گۆڕانی خێـرا لـە پەسـتانی هەوادا کە لەئەنجامی گۆڕانی بەرزاییـەوە ڕوودەدات دەبێتـەهۆی وەڕسـی و هەراسانکردنی توندی جەستەیی.

هەموان دڵنیاین لەسەردەمی پێغەمبەری ئازیزدا (ﷺ) هـیچ زانیارییـەك نـەبووە دەربـارەی گۆڕانی پەسـتان و کەمبوونـەوەی ئاسـتی پەسـتان بـە بەرزبوونەوە لە ئاسماندا، ئەمەش دەبێتەهۆی ناڕەحـەتی لـە هەناسـەداندا، بەڵکو زیاد لەوەش تـەقینی خوێنبـەرەکان لـە بەرزاییـە زۆرەکانـدا، لەگـەڵ ئەوەشدا ئایەتـە پیرۆزەکـە بەڕوونی ئامـاژە بـەوە دەدات کاتێـك مـرۆڤ لـە ئاسمانـدا بەرزدەبێتـەوە سـنگی تـەنگ دەبێتـەوە و بـە بەرزبوونـەوەی زیاتریش حاڵەتەکە سەختتر دەبێت تاکو دەگاتە زۆرترین بڕی ناڕەحـەتی و بێتاقەت بوون.

# شێوەی زەوی گۆیی تەواو نییە

مـرۆڤ تـاكو سـەدەكانی ناوەڕاسـتیش گومـانی دەبـرد كـە زەوی وەك ڕووتەختێك وایە، بڕوای وابوو كاتێك كەسێك بەسەر زەویدا بڕوات تا كۆتایی ئەو ڕووتەختە ئەوا لە كەنارێكیەوە بۆ شوێنێكی نادیار دەكەوێتە خوارەوە. ئەم بیرۆكەیە تاكو سەدەی بیستەم بەردەوام لە ئارادا بوو، تـا ئەودەمەی لەڕێی لێكۆڵینەوە و بەراوردەكانـەوە مـرۆڤ گەیشـتە ئـەو بڕوایـەی شـێوەی زەوی گۆییە، ئەم بڕوایەش گۆڕانكاری بەسەردا هات.

لەپاش گەیشتنی مرۆڤ بە نێوەندی بۆشایی ئاسمان و وێنـەگرتنی زەوی (هەموو زەوی لە دوورەوە) دەركەوت شێوەی ڕاستەقینەی زەوی شێلمییە. بینرا زەوی لەملا و ئەولایەوە (جەمسەری باكور و باشور) كەمی كردووە تـا وەك شـێلم یـان لالەنگییـەكی گـەورەی لێهـاتووە، چـەمانەوەكەی وەك گـۆ لەهەموو لایەكانیەوە وەك یەك نیین، بەڵكو لە هـەردوو جەمسـەری بـاكور و باشورییەوە كەمیكردووە. ئەوە بووەتە ڕاستییەكی سـەلمێنراو كـە تـیرەی زەوی لە هێڵی كەمەرەییدا بچوكترە لە تیرەكەی لە جەمسەرەكانیدا.

قورئـــانی پـــیرۆز باســـی ئـــەو كەمكردنـــەی دوو لای زەوی دەكـــات و دەفـــــــەرموێت: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾الأنبياء/٤٤، واتە: ئایا ئەوانە نابینن ویستی ئێمە لەسەر زەویدا

دەوری هەیە؟ لابەلاکانی کەم دەکەینەوە و دەسەڵاتیان لێ زەوت دەکەین. ئایا مەگەر ئەو (بێباوەڕانە) سەرکەوتوون؟

پاشـان ئەگـەر بـە وردی بڕوانینـە ئیعجـازی قورئـان دەبیـنین چـۆن ڕەوانبێژی و ڕاستی زانستی کۆکردووەتەوە، کاتێك دەفەرموێت: ﴿وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ﴾ الحج/٢٧، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بانگی خەڵکی بکە با بێن بۆ حەج بە پیادە یا بە سواری (ئەو وشترانەی کە دووری ماوەکە) لاوازی کردوون، و لە هەموو ڕێگایەکی قووڵەوە (عمیق) با بێن.

لێرەدا پێویستە بپرسین: بۆچی قورئانی پیرۆز فەرمووی (مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ) و نەیفەرموو (من کل فج بعید)؟

لەوکاتەدا وشەی (بعید) (واتە دوور) بەکاردەهێنێت ئەگەر شێوەی زەوی تەخت بێت، بەڵام لەبەرئەوەی شێوەی زەوی تەخت نییە، بۆیە دەستەواژەکە بە (عمیق) واتە قووڵ هاتووە.

ئێستا ئەگەر کۆمەڵە هێڵێکی ڕاست لەنێوان کەعبە و ئەو دەوڵەتانەی تردا بکێشین کە دەکەونە ڕووەکانی تری زەوی، دەبینین ئەو هێڵانە بە قوڵاییەکانی زەویدا تێپەڕدەبن نەك بەسەر زەویدا... بەڕاستی لە وردەکاریی ماناکانی قورئانە کاتێك دەستەواژەکە بەوجۆرە هاتووە: ﴿مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ﴾.

# لەرینەوەکانی دەنکۆڵە خۆڵییەکان

لەساڵی (١٨٢٨ن)دا زانایەکی بەریتانی "Brown" ئاشکرایکرد کە ئاوی باران لەکاتی دابەزینیدا دەبێتـەهۆی لەرینـەوەی خـاك، واتـە لەراندنـەوەی دەنکۆڵـە خۆڵییـەکانی خـاك کـە دەنکۆڵـەی زۆر وردن، بەشـێوەیەك گەورەترینی ئەو دەنکۆڵانە تیرەیان نزیکی (٣٠٠ مایکرۆمەتر)ـە.

ئەم دەنکۆڵانە بریتین لە چەند چینێکی کانزایی جیاوازی لەسەر یەك، ئەو چینانە پێش باران بارین پێکەوە نووساون و لەسەر یەکن، بەڵام کاتێـك باران دەبارێتە سەریان، بەهۆی جیاوازی کانزاکانەوە لەنێوان دەنکۆڵەکانـدا بارگـەی کارەبـایی جیـاواز دروسـتدەبێت و بـە ئـایۆنبوون ڕوودەدات (واتـە دەگۆڕێت بۆ ئایۆن، ئایۆنیش ئەتۆمێکە بارگـەی کارەبـایی هەیـە... ئەگـەر یەکێك یان زیاتر لە بارگە کارەباییەکانی ئەتۆمەکـە کـەمیکرد ئـەوا دەبێتـە ئایۆنێکی موجەب، خۆئەگەر زیادیکرد دەبێتە ئایۆنی سالب و پێیاندەوترێت چالاك). دەنکۆڵە خۆڵییەکان بەهۆی ئەم بەئایۆنبوونـەوە دەلەرێنـەوە و بـە چـوونە ژوورەوەی ئـاو بـۆ نێوەنـدی ئـەو دەنکۆڵانـە لەرینەوەکـە دەستپێدەکات.

ئەم لەرینەوەیـە سـوودێکی زۆری هەیـە، چونکە چینەکان یـەك لەگـەڵ یەکدا پێکەوەنووساون و بەهۆی لەرینەوەکانەوە بوارێك بۆ چوونە ژوورەوەی ئاو لەنێوان چینەکانەوە دروسـت دەبێـت... کـاتێکیش ئـاو دەچـێتە نێـوان چینەکانەوە دەنکۆڵەکان زیاددەبن و دەخلیسکێن.

کە دەنکۆڵە خۆڵییەکان تێربوون بە ئاو، وەك کۆگایەکی بچوکیان لێدێت کە ئاو لەنێوان چینەکانیاندا دەپارێزن. لەم حاڵەتـەدا وەك ئەوەیـە مامەڵـە لەگەڵ کۆمەڵێك کۆگای وردی کانزایی نێو خاك بکەین، ڕووەك ماوەی (٢-٣ مانگ) لەو کۆگا وردانەوە ئاو وەردەگرێت. خۆئەگـەر بـەو شـێوەیە نـەبێت (واتـە لەرینـەوەی دەنکۆڵـەکان و خـەزنبوونی بڕێـك ئـاو لـەنێوان چـینە دەنکۆڵەییەکانـدا نـەبێت) ئاوەکـە بـەنێو گڵەکـەدا ڕۆدەچـێتە خـوارەوە و لەماوەی هەفتەیەکدا ڕووەکەکە دەمرێت، بەڵام کۆگا گەورەکانی ئاو درێـژە بە ژیانی ڕووەکەکە دەدەن.

"براون" لەساڵی (١٨٨٢ز) دا دۆزییـەوە کاتێـك بـاران دەبارێـت، خـۆڵ توشی لەرینەوە دەبێت، دیاردەکەش بە (لەرینەوەی براون) ناسراوە، بەڵام لەڕاسـتیدا پـێش لـەدایکبوونی "بـراون" زانیارییەکـە هـەبووە، پێویسـتە ئەوانەی مێژووی زانست دەنووسنەوە هەرگیز نەڵێن "براون" یەکـەم کەسـە باسـی ئـەم دیاردەیـەی کـردووە، گـەر ئینسـافیان هـەبێت، پێویسـتە بڵـێن یەکەم باسکردنی ئەم دیاردەیە لە قورئانی پیرۆزدایە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾الحج/٥، واتـە: تـۆ زەوی دەبینیت (لە وەرزی زستاندا) خامۆشە، بەڵام کاتێك ئـاوی بـارانی بەسـەردا دەبارێنین دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و (تۆوەکان) چەکەرە دەکەن و ڕەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن و سەر دەردێنن، ئەوسا لە هەموو گژوگیا و گـوڵ و گوڵزارێکی جوان پەیدا دەبێت.

# گەردەلول و ئاگر

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾البقرة/٢٦٦، واتە: ئایا هیچ کەس لەئێوە ئاوات دەخوازێت باخێکی دارخورما و ڕەزی هەبێت و جۆگە و ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا بڕوات و هەموو جۆرە بەروبومێکی تێدابێت؟ ئینجا خۆی پیر ببێت و نەوەیەکی منداڵ و لاوازی هەبێت، کەچی لەناکاو گێژەڵوکەیەکی ئاگراوی هەڵبکاتە سەری و بیسوتێنێت، ئا بەوشێوەیە خوا ئایەت و بەڵگە و نیشانەکان دەخاتە بەرچاوتان تا تێفکرن و بیربکەنەوە.

بەو پرسیارە دەست پێدەکەین کە ئایا گێژەڵوکە و گەردەلول لە پێکهاتە فیزیاییەکەیاندا ئاگر هەیە؟

نوێترین لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە گێژەڵوکە و گەردەلول تائێستا نەگەیشتونەتە ئەوەی بیسەلمێنن ئاگر لە پێکهاتەی گەردەلولدا هەیە... دەکرێت ئەم پرسیارە لە زانایانی تێڕوانین بکەین: ئایا گەردەلول ئاگر دروست دەکات؟ ئایا گەردەلول ئەم ئاگرە لەخۆیدا هەڵدەگرێت؟ ئەگەر وەلاّم بە "بەڵێ" بوو (کە واقیعیش دڵنیایی ئەوە دەدات) لەم ئایەتەدا پێشینە و ئیعجازێکی زانستی ورد و جوان هەیە.

## مانای زمانەوانی گێژەڵوکە (إعصار):

لـە (مصـباح المـنیر)دا هـاتووە (إعصـار) ئـەو بایەیـە کـە خـۆڵ بەرزدەکاتـەوە لـەنێوان ئاسمـان و زەویـدا و خـول و گێـژی دەدات، وەك ستوونێك بەرزدەبێتەوە.

لە (مختار الصحاح)دا هاتووە: (إعصار) بایەکە کاردەکاتـە سـەر تـۆز و بـەرەو ئاسمـان بەرزیدەکاتـەوە، بەشـێوەی سـتوونێك، وەك پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَأَصَابَهَآ إِعۡصَارٌ﴾. هەروەها وتـراوە گـەردەلول کاریگـەری لەسەر ئەو هەورانە هەیە کە هەورەگرمە و بروسکەیان هەیە.

لە زانستی جوگرافیای نوێدا (إعصار) ناوچەیەکی پەستانە کە (با) ڕووە و سـەنتەرەکەی کێشـدەکات بـە ئاڕاسـتەی پێچـەوانەی میلـی کاتـژمێر لەنێوەگۆی باکوردا و بەپێچەوانەشەوە لەنیوەگۆی باشوردا.

زانایان گەردەلولیان پۆلێن کردووە بۆ گـەردەلولی قـەمعی و گـەردەلولی خولگەیی... لەو گێژەڵوکە و گەردەلولانەی لە بەڕێوەبەرێتی نەتـەوەیی بـۆ زەریاکـان و بەرگەهـەوا (NOAA) تۆمـارکراوە، گـەردەلولی ئەنـدرۆ (Andrew) یـە کـە لەسـاڵی (١٩٩٢ز) دا پـانزە کەسـی کوشـت و مـاڵ و سـامانێکی زۆری ( بـە بـەهای ٢٥ بلیـۆن دۆلار) لـە باشـوری فلۆریـدا لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا تێکشـکاند و وێرانکـرد. هـەروەها گـەردەلولی ئۆپـاڵ (Opal) لەسـەر کەنـداوی مەکسـیك لـە سـاڵی (١٩٩٥ز) بووەهۆی وێرانکارییەکی گەورە و زیاتر لە (٢٨) کەسی کوشت. گـەردەلولی بۆننی (Bonnie) بەسەر کەنداوی مەکسیکدا لەساڵی (١٩٩٨ز) تێپـەڕی،

هـەروەها گـەردەلولی برێـت (Bret) لەسـەر ناوچـەیەکی کشـتوکاڵی لـە تەکساس هەڵیکرد و ئەو کێڵگانەی وێرانکرد.

لێکۆڵەران هێزی گەردەلولەکان لە دابەشکردنێکی پلەییانەدا دادەنێن، بەوپێیـەی گـەردەلولی (ئۆپـاڵ) هێزەکـەی گەیشـتە پـۆلی چـوار، هێـزی گەردەلولی هوگۆ (Hugo)ش پۆلی پێنج بوو کە توندترە.

ئەمانەو چـەندین نموونـەی گـەردەلولی تـر بـە هێـز و تونـدیی جیاجیـا و لەجێگاکانی تری جیهاندا... جێگای سەرنجە هەرکاتێك گەردەلول ڕێکەوتی ناوچـە دارسـتانەکانی کردبێـت، واتـە ئـەو ژینگەیـەی کـە ئامادەباشـی ئاگرکەوتنـەوەی هەیـە، ئاگریـان تێـدا کەوتووەتـەوە. چـەندین حاڵـەتی ئاگرکەوتنەوە تۆمارکراوە کـە لەڕاسـتیدا بـەهۆی مرۆڤـەوە نـەبووە، بـەڵکو ئاگرکەوتنەوەکە سروشت دروستیکردووە، واتە خۆی خۆی داگیرساندووە، ئەمەش بەهۆی کاریگەرییـەکی دەرەکیـەوە، بەڕادەیـەك کـە بپرسـین: ئایا دەگونجێت سەرچاوەی ئاگرە کڵپەسەندووەکە دابەزینی گەردەلول بووبێـت بۆی؟

دەکرێـت لـەنێوان گـەردەلول و ئاگرکەوتنـەوە لـەو شـوێنانەی ڕووەك داپۆشـیون و دارسـتانەکان پەیوەندییـەك هـەبێت، بـەڵام ئـەو پرسـیارەی ڕووبـەڕووی زانایـانی تایبەتمەنـدی سروشـت دەکرێتـەوە: ئایـا دەگونجێـت گـەردەلول مانـای وشـەی ئـاگری تێـدابێت؟ یـان بەلایـەنی کەمـەوە میکانیزمێکی ڕووناککەرەوەی تێدا بێت بۆ ئاگرکەوتنەوە؟

گەر یەکێك لەو دوو گریمانەیە دروست بێت، ئایەتە پیرۆزەکـە ﴿إِعۡصَارٞ فِيهِ نَارٞ﴾ ئایەتێکە جێگای لێکۆڵینەوەی ئیعجازی زانستییە.

## جۆرەکانی (با) له قورئانی پیرۆزدا

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴾الحجر/٢٢، واتـە: ئێمـە (بـا)مـان کردووە بـەهۆکاری پیتانـدنی ڕووەك و دارو درەخـت، و هـەر بـەهۆی بـاوە، باران لە ئاسمانەوە دەبارێنین و ئێوەی پێ تێراو دەکـەین، بێئـەوەی ئێـوە ئەو ئاوانەتان خەزن کردبێت.

لە زانستی نوێدا ئەم ئایەتە ڕاڤە کراوە، (بـا) پیتێنـەری ڕووەکەکانـە... دوای ئەوەی سەلمێنراوە کە زۆرێك لە ڕووەکەکان پێویستیان بە (با) هەیـە وەك یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی پیتاندن.

بـا پیتێنـەری ئـەو هەورانەشـە کـە بارانیـان لێـوە دەبارێـت. بـا هـەڵم بەرزدەکاتەوە، هەورەکان دروستدەکات، باران پێکدێنێت.

جۆرەکـانی (بـا) وەك لـە قورئـانی پـیرۆزدا ئاماژەیـان پێـداوە، لـەم ئایەتانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

﴿ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾الشوری/٣٣، واتە: خۆئەگەر بیەوێت با دەوەستێنێت و لەسـەر پشـتی دەریاکە دەوەستن و لەکاردەکـەون، بەڕاسـتی ئـا لـەم توانـا و دەسـەڵاتەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ هەر کەسێك کە خۆگر و سوپاسگوزارە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ

أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾یونس/٢٢، واتە: (ئەی هاوەڵگەران) خوا ئەو زاتەیە کە لە وشکانی و دەریادا هاتوچۆتان پێدەکات، هەتا ئەو کاتەی کە لە کەشتییەکاندا دەبن و دەیانگوێزنەوە بەهۆی با و شەماڵێکی پاك و ئارامەوە و هەموان پێی دڵخۆشن، ئەوە بایەکی توند و بەهێز و سەخت بەرەو کەشتییەکە بێت و هەڵبکات، لە هەموو لایەکەوە شەپۆل بۆیان بێت، ئیتر وا بزانن کە دەورە دراون و (ڕزگاربوونیان ئەستەمە، ئا لەوکاتەدا خەڵکەکە بەسۆزەوە) هانا و هاوار بۆ خوا دەبەن، دڵنیان خوا نەبێت کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت، لەکاتێکدا بیروباوەڕ و ئاینیان بەتەواویی پاك و پوخت و یەکلایی دەکەنەوە بۆ خوا، بۆیە بەسۆزەوە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر لەم بەڵایە، لەم تەنگانەیە، ڕزگارمان بکەیت، ئەوە بەڕاستی دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانتەوە.

هەروەها خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴾الإسراء/٦٩، واتە: ئایا دڵنیان و ناترسن لەوەی جارێکی تر لە کەشتیدا ڕێتان بکەوێتە ناو دەریاوە، ئەوسا بایەکی بەهێزی سەخت هەڵبکاتە سەرتان، ئینجا بەهۆی کافربوون و یاخیبوونتانەوە نوقمی دەریاتان بکات؟! لەوەودوا کەسیشتان دەستنەکەوێت بتوانێت داکۆکیتان لێبکات لای ئێمە!!

یان دەفەرموێت: ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴾الحاقة/٧، واتە: حەوت شەو و هەشت ڕۆژ هەڵیکردە سەریان، بەردەوام و بەهێز دەتبینی (ئەگەر لەوێ بوویتایە)

ئـەو خەڵکـە هـەموو لاڵ و پـاڵ لێـی دەکـەوتن هـەروەك قـەدی دارخورمـای لەڕیشە هەڵکەنراو، چۆن بەئاسانی دەکەوێت و شەق دەبات.

پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْأٓخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾ فصلت/١٦، واتـە: ئەوسـا ئـیتر ئێمـە بایـەکی تونـد و زۆر سـاردمان هـەڵکردە سـەریان لـە چـەند ڕۆژێکـی شـومدا، تـا هـەر لـە ژیـانی دونیـادا بـە سـزای سەرشۆڕیان بگەیەنین و تاڵاو بکەین بە گەروویاندا، بێگومان سزای قیامـەت زیاتر سەرشۆڕکەر و تاڵترە و ئەوانە سەرفراز و ڕزگار نابن.

زانایـانی ئـەم سـەردەمە (بـا) دابـەش دەکـەن بۆ بەشـگەلی جیـاواز بـۆ سـوودی فڕۆکـەوانی و کەشـتیەوانی بەگشـتی، هـەر بەشـێکیش نـاوێکی نێودەوڵەتی بۆ دانراوە.

# داماڵینی ڕووناکی ڕۆژ

زانستی نوێ سەلماندوویەتی شـەو لـە هەمووجێگایەکـەوە دەوری زەوی داوە، ئـەو بەشـەی حاڵـەتی ڕۆژی تێـدا دروسـت دەبێـت هـەوای دەوری زەوییە، کە توێکڵێکی تەنك دەنوێنێت (بەگوێرەی گەردوونـەوە) وێکچـووی پێستە. گـەر زەوی سـوڕایەوە حاڵـەتی ڕۆژ (کـە بـەهۆی دانـەوەی تیشـکی هـاتووی خـۆر لـە گەردیلـەکانی هـەواوە دەبێتـەهۆی ڕوونـاکی ڕۆژ) دادەماڵرێت، بەو سوڕانەوەیەی ڕۆژیش لە شەو دادەماڵرێت.

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴾یس/٣٧، واتە: بەڵگە و نیشانەیەکی ئاشکرا بۆیان، شەوە، کە پۆشـاکی ڕوونـاکی ڕۆژی لەبـەر دادەمـاڵین، بەوهۆیـەوە دونیایـان لێ تاریـك دەبێت.

# بیردۆزی ڕێژەیی

بـیردۆزی ڕێـژەیی لـە قورئانـدا لـەو ئایەتـەوە هەڵـدەهێنجرێت کـە دەفـەرموێت: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾الحج/٤٧، واتـە: خوانەناسـان پەلـەت لێدەکەن ئەو سزایە زوو یەخەیان پێبگرێت، بێگومان هەرگیز خوا لە بەڵێنی خۆی لانادات، بەڕاستی ڕۆژێك لەلای ئەو پەروەردگارەت وەکو هـەزار ساڵ وایە لەوەی دەیژمێرن.

﴿يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾السجدة/٥، واتە: ئـەو خوایـە لـەژوور ئاسمانـەوە کاروبـاری زەوی ڕێکدەخات و سەرپەرشتی دەکات، لەوەودوا ڕووداوەکـان و بەسـەرهاتەکان و کـاروکردەوەی بەنـدەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ لای، لەڕۆژێکـدا کـە بەرامبـەر هەزار ساڵە بەو حسابەی ئێوە دەیکەن.

خەڵك بە سەرسامیەوە دەیپرسی: ئـاخۆ چـۆن دەبێـت یـەك ڕۆژی ئێـرە (سەر زەوی) بەرامبەر هەزار ساڵی جیهانەکانی تر بێت؟

زانسـت ئـەو سەرسـامیەی ڕەوانـدەوە ئەودەمـەی وتـی: ئـەوە ڕاسـت و دروستە... ئەگەر خێرایی تەن زیادبکات کاتەکەی هێواش (خاو) دەبێتەوە، بەڕادەیەك ئەگەر هاتوو تەنێك بە خێرایی ڕووناکی ڕۆیشت، کات (بە نزیکی) دەوەستێت.

هەر ئەوەش زانا "ئەنیشتاین" لە بیردۆزی ڕێژەییەکەیدا سەلماندی، کاتێك وتی: "خاڵی نزیك لە سەنتەری زەوییەوە هێواش دەجولێت، بەلاّم خاڵی دوور لە سەنتەری زەوی بە خێراتر دەجولێت، چونکە ئەو کەوانەیەی خاڵی یەکەم دەیبڕێت بچوکترە لەو کەوانەیەی خاڵی دووەم لە هەمانکاتدا دەیبڕێت".

لە هەواڵە زانستییەکانی هەفتەی یەکەمی مانگی حەوتەمی ساڵی (١٩٧٦ز)دا هات، دەیوت: "زانایانی زانکۆی (میریلاند)ی ئەمریکی دروستیی بیردۆزی ئەنیشتاینیان بۆ سەلما دەربارەی ئەو کاتەی خێراتر دەگوزەرێت لە لوتکەی چیادا بە بەراورد لەگەڵ دۆڵ... بۆ ئەوەش کاتژمێری ئەتۆمیان لەسەر زەوی و لەنێو فڕۆکەیەکدا دانا کە لە بەرزایی (١٠ هەزار مەتر)دا دەفڕی، بینیان کاتژمێری نێو فڕۆکەکە لە کاتژمێرەکەی سەر زەوی پێشکەوت.

هەموو ئەوانە ئاکامێکی سروشتی ترمان دەدەنێ: گەر زەمەن (کات) وەستا کە بریتیە لەو هزرەی لە بەدواییەکداهاتنی ڕووداوەکانی جیهانەوە وێنای دەکەین، ئیتر لەوکاتەدا لازەمەن (نەمانی کات) دەخولقێت.

ئەوەش دەمانگەیەنێتە سەلماندنی زانستیانەی نەمریی (تا ئەبەد ژیان)، لەژێر ڕۆشنایی زانستیانەی بیردۆزی ڕێژەیی پێشکەشی کردووە، هەروەك لە ئایەتی (١٠٨)ی سورەتی (هود)دا هاتووە:

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ﴾، واتە: ئەوانەش کە کامەران و بەختیار کراون ئەوە لە بەهەشتدان، بۆ هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە هەتا ئاسمانەکان و زەوی هەبێت، (کە ئەویش بۆ هەتاهەتایی دروستکراوە لە قیامەتدا) و

مەگەر پەروەردگارت ویستی (گۆڕانکاری) هەبێت، ئەمە بەخششێکە هەرگیز کۆتایی نایەت.

لەدوای هەموو ئەوە ئایا هەست ناکەیت قورئانی پیرۆز هەمیشە (نویّ)ی تێدایە، لەگەڵ ئیعجازی زانستی بۆ هەموو سەردەمەکان، دروست وەك ئەوەی لە ئەمڕۆماندا دابەزیبێت؟!

# نەبینینی ئەو تەنانەی بەخێرایی زیاد لەخێرایی ڕووناکی دەجوڵێن

مادام بینین تەنها بەهۆی دانەوەی تیشکی ڕووناکیەوە لە تەنە جوڵاوەکانەوە بۆ چاو جێبەجێ دەبێت، کەواتە ئەستەمە چاودێری ئەو تەنانە بکرێت کە بەخێراییەکی گەورەتر لە خێرایی ڕووناکی دەجوڵێن، چونکە لەو حاڵەتەدا ڕووناکی ناتوانێت لە تەنەکانەوە بۆ چاوی چاودێرەکە بدرێتەوە و چاودێرەکە هەستی پێبکات.

ئەم ڕاستییە زانایەکی بەیروتی دۆزییەوە، لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەبیرۆکەی (سەرژمێری شوێنەکان). ئەو دەڵێت: بۆ بینین زانینی ئەو شوێنەمان بەسە کە تیشکەکە پێیدەگات و پێویستمان بەوە نییە کە نایگاتێ، چونکە ئەو شوێنە یان ئەوز شتەی تیشك پێیناگات هەستەکانیش دەرکی پێناکەن.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾الأنعام/١٠٣، واتە: دەزگای بینایی و (بۆچوونی مرۆڤ) ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاری ئەو خوایە هەموو شتێکی گرتووەتـەوە، ئاگاداریشە بەهەموو دەزگاکانی بینایی، هەر ئەوە وردبین و ئاگایە.

یان دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾التوبة/٢٦، واتە: (لە جـەنگی بەدردا) سەربازانێکی دابەزاند کە نەتاندیوە.

# ئەندازەگیری لە بەدیهێنانی زەویدا

بێگومـان خـوای گـەورە، هـەموو شـتێکی بـە ئەنـدازەی دیـاریکراو بـــەدیهێناوە، وەك دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ﴾القمر/٤٩-٥٠، واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە و نەخشەی دیاریکراو بەدیهێناوە، فەرمانی ئێمە تەنها یـەك وشـەیە دەڵێین ببە دەستبەجێ دەبێت، وەك چاوتروکاندنێك.

گەر تەماشای پێگە و شوێنی جوگرافی هەسارەی زەویمان کـرد، بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە هـەموو شـتێك لـەم گەردوونـەدا بـە ئەنـدازەگیری تـەواو و تائەوپەڕی وردیی و بە کارزانییەوە بەدیهێنراوە.

ئەم گەردوونە موعجیزەیە لە پێکهاتەیدا، سەرسامکارە لە فراوانیدا، کـە زەویش لەخۆدەگرێت، بەپێی کۆمەڵێك ڕێسای چەسپاو دەڕوات، گەر نەنگی و کەموکوڕییەکی تێدا دەرکەوت، ئێمە کە لەسەر زەوی دەژین، تیادەچین!

بارودۆخ و ئـەو ڕێسـایانەی دەسـتی بەسـەردا دەگـرن، دەتـوانین لـەم خاڵانەدا ڕوونی بکەینەوە:

١. گـەر زەوی دوو ئەوەنـدەی ئێسـتای لـە خـۆر دوورتـر بوایـە، بـڕی ئـەو گەرمییەی دەمانگەیشتێ دەبووە چارەکێکی ئـەوەی ئێستا دەمانگاتێ.. زەویش بە ماوەیەکی درێژتر خولی خۆیی تەواو دەکرد، دوابـەدوای ئـەوەش وەرزی زستان درێژتر دەبوو و بەوەش هـەموو زینـدەوەرەکانی سـەر زەوی ڕەق دەبوونەوە و دەیانبەست.

٢. گەر زەوی لە خۆر نزیك ببێتەوە بە ئەنـدازەی نیـوەی دووریـی ئێسـتای نێوانیان، ئەوکاتە ئەو بڕی گەرمییەی زەوی لە خۆری وەردەگرێت دەبێتـە چوار هێندی ئەوەی ئێستا وەریـدەگرێت، خێرایـی سوڕانەوەشـی بـەدەوری خۆردا خێراتر دەبێت و ئیتر ژیان ئەستەم دەبێت.

٣. بەرگەهەوای دەوری زەوی دەبێتەهۆی پاراستنی زەوی لە ملیۆنان تـەن لە شوهب کە لەفەزای دەرەوە دادەبەزن، هەروەها لە تیشکی گـەردوونیش دەیپارێزێت کە ئەگەر بڕێکی لێ بگاتە زەوی ژیان خاپوور دەکات.

٤. ئەگەر بڕی ئۆکسجین بەڕێژەی (٥٠٪) یان پتر لە هەوادا هەبێت (زیاتر لە بـڕی ٢١٪)، ئەوکاتـە هـەموو ئـەو ماددانـەی توانـای گڕگرتنیـان هەیـە لـە جیهاندا ئەگەری کڵپەسەندنیان دەبێـت، بەڕادەیـەك کـە یەکـەمین پریشـکی درەختێك دەبێتەهۆی سوتاندنی تەواوەتی دارستانێك.

خۆئەگەر ڕێژەی ئۆکسجین (١٠٪) بێت، دیسانەوە ژیان لەسـەر ڕووی زەوی نامێنێت.

٥. گەر بڕی ئاوی بەسـتووی سـەر جەمسـەرەکان بتوێتـەوە و ببێتـە ئـاوی سـەر زەوی، ئـەو سـاتە ئاسـتی ئـاوی دەریـا و زەریاکـان بەرزدەبێتـەوە و

زۆربەی زۆری ڕووبەری کیشوەرەکان و چی دیمەنی ژیانی لەسەرە، نقومی ئاو دەبن.

٦. گەر ئاوی زەریاکان شیرین بوونایە، بۆگەنیان دەکرد و ژیانیش لەسەر زەوی توشی گەورەترین کارەسات دەبووەوە، بەڵام ئێستا سوێریی ئاوی دەریا و زەریاکان ڕێی لە خراپبوون و بۆگەن کردن گرتووە. خۆئەگەر کلۆر لەگەڵ سۆدیۆم یەکیان نەگرتایە، خوێ بوونی نەدەبوو.

٧. ئەگەر یاساکانی کێشکردن نەبوونایە، لەکوێ گەردیلەکان گەردەکانیان دەگرت و گەردیش گەردیلەکان، لەکوێ خۆر خۆر دەبووو زەویش زەوی؟

٨. ئەگەر شاخەکان لەسەر ڕووی زەوی نەبوونایە، زەوی پەرتپەرت دەبوو و ئەم توێکڵە شیاوەی بۆ ژیان نەدەبوو.

لێرەدا ئیعجازی قورئانی پیرۆز لەو وتەیەی پەروەردگاردا دەردەکەوێت کە دەفـــەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴾الأعراف/١٨٥ واتە: ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خوا لە ئاسمانەکان و زەویدا و ئەو هەموو شتانەی کە خوا بەدیهێناون؟ (بۆ ئەوەندە بێئاگان؟) خۆ بەڕاستی ئاکامیان نزیك بووەتەوە، جا بە چ گوفتارێکی تر لەدوای قورئان باوەڕ دەهێنن؟

یاخود دەفەرموێت: ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴾الذاریات/٢٠، واتە: بێگومان لەسەر گۆی زەویدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە (لەسەر دەسەڵات و زانیاری خوا) بۆ کەسانێك کە بەشوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن.

# مێژووی شەو و ڕۆژ

زانا پسـپۆڕەکانی بـواری مێـژووی دەسـتپێکردنی بـوون لەسـەر زەویـدا دەڵێن: زەوی دوای جیابوونەوەی لە گەردوون لە سـەرەتادا باوردۆخـەکانی جێگیر نەبوون، لەکاتێکدا خێرایـی سـوڕانەوەی بـەدەوری خۆیـدا زۆر زیـاتر بووە لەخێرایی ئێستای. بوونی ئەو خێراییـە زۆرەش بێگومـان دەبێتـەهۆی کورتبوونەوەی شەو و ڕۆژ و لەمەشەوە زەوی توشی لاسەنگی و لەرینەوەی مەترسیدار دەبێت.

زاناکـان ئـەم حاڵـەتی خێراییـە زۆرەی جوڵـەی زەوی دەگێڕنـەوە بـۆ کۆمەڵێك هۆکار، لەوانە: جێگیر نەبوونی ڕووبار و دەریا و زەریاکـان لەسـەر ڕووی زەوی بەهۆی گەرمی ڕووەکەیەوە (کە لەوکاتـەدا پلـەی گەرمییەکـەی زۆر بەرز بووە)... هەروەها ئەو گەرمییەی لە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ترەوە کۆبوونەتـەوە سـەرجەمیان کاریگـەربوون لەسـەر زەوی، لەئـەنجامی ئەمانەشەوە ڕووبارەکان (بەهەڵم)بوون و بەرگەهەوای زەوییان دادەپۆشـی. سەرەڕای ئەوەی شاخەکانیش تا ئەوکاتە دروست نەببوون.

ئەو هۆیەی پاڵی بە زەوییەوە دەنا بۆ سوڕانەوەی بەدەوری خۆیدا بـەو خێراییـــە زۆرە و دروســـتکردنی شـــەو و ڕۆژ بەوشـــێوەیە (وەك زاناکـــان پێیگەیشـتون)، نـاجێگیری زەوی بـوو بـەم بارودۆخـە کۆتاییـە کـە ئێسـتا وەریگرتووە... تا ئەو کاتەی دەریـا فرپیوەکـان کـە لەشێوەی هەڵمـدابوون دابەزینـە سـەر زەوی و لەئاکامـدا (٣/٤)ی چـێوەی زەوییـان داپۆشـی و

بـەهۆی ئەمەشـەوە پەسـتانێکی گـەورە لەسـەر ڕووی زەوی دروسـت بـوو، هەروەها پێکهاتنی شاخەکان و تەشـەنەکردن و بڵاوبوونـەوەی دەریاکـان و لـە بـوونی ئـاوی دەریاکانیشـەوە ژیـان و باخچـەکان دروسـتبوون و ئیـدی لێرەوە ژیان دەستپێکرد.

خوای گەورە لەبارەی دەستپێکردنی بەدیهێنانی زەوی و بارودۆخـەکانی چـەندین ملیـۆن سـاڵ پێشـتری، دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾الأعـراف/٥٤، واتــە: بێگومــان پــەروەردگارتان (الله) یــە کــە دروستکاری ئاسمانـەکان و زەوییـە لـەماوەی شـەش ڕۆژدا، پاشـان لەسـەر چووە سەر عەرشی فەرمانڕەوایی (بـەو شـێوەیەی کـە لایـەق بەخۆیـەتی). شـەو، ڕۆژ دادەپۆشـێت و بـەخێرایی (عەودالّـە) بەدوایـدا. خـۆر و مـانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان) بە فەرمانی ئەو کەوتونەتە گەڕ و لە فەرمانی دەرناچن، ئاگاداربن وبـزانن و تێفکـرن کـە هەرچـی دروسـتکراوە سـەر بـەو زاتەیە و ئەو بەدیهێناوە (کەواتە دەبا) هەموانیش فەرمانبەرداری ئەو بـن و لەفەرمانی دەرنەچن، موبارەك و پیرۆز و گەورەیە زاتی (الله) پـەروەردگاری هەموو جیهانەکان.

کاتێك بە وردی لەم ئایەتە ڕادەمێنین، تێبینی ئەم خاڵانە دەکەین:

یەکـەم: ئـەم ئایەتانـە دەربـارەی کـاتی دەسـتپێکردنی بـەدیهێنانی گەردوون دەدوێن (لە گەردوونیشدا زەوی). پێش بەدیهێنانی ئاسمانـەکان و زەوی، خـوای گـەورە لەسـەر عەرشـەکەی وەسـتا و پاشـان شـەو و ڕۆژ دروستبوون.

دووەم: لە وتەی خوای گەورە ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾، ﴿يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾ واتە بەخێرایی داوای دەكات و عەودالّیەتی. ئەمە بەلگەی جولەی زۆرخێرای زەوییە لەوكاتەدا. خاوەنی تەفسیری (زبدة التفسير من فتح القدير) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەلّێت: ﴿يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾ حالّی شەوە كە زۆر بەخێرایی داوای ڕۆژ دەكات.

لەئایەتی (٣)ی سورەتی (الرعد)دا دەستەواژەكە دەگۆڕێت، چونكە ئاماژە بە تێپەڕبوونی ماوەیەكی زەمەنی دیكە دەكرێت بەسەر بەدیهێناندا: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾الرعـــــد/٣، واتە: هەر ئەو زاتە زەوی پان و بەرین كردووەتەوە، كەژ و چیا و ڕووباری زۆری تێدا دابینكردووە، لە هەموو بەروبومێك جووتی فەراهەم هێناوە، شەوی والێكردووە ڕۆژ دابپۆشێت، بەڕاستی لەوشتانەدا بەلگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانێك بیربكەنەوە.

لێرەدا سەرنج دەدەین ئایەتەكە باس لەو ماوە زەمەنییە دەكات كە زەوی تیایدا پان و بەرین بووە و خوای گەورە بەهۆی شاخەكانەوە جێگیری كردووە و ڕوبارەكان بلاّوبوونەوە و بەروبوومیش پێگەیشت و پەرەیسەند. هەربۆیە لەمكاتەدا دەستەواژەی شەو و ڕۆژ لە ئایەتەكەدا هاتووە، بەلاّم وشەی (حثيثا – زۆر بەخێرایی) نە لەپێش و نە لەدوایشیانەوە نەهاتووە، چونكە لەوكاتەدا زەوی جێگیر بووە و لە جولّەكەیدا پێویست بەو خێراییە زۆرەی ناكات. ئیتر لەوكاتەدا زەوی خێرایی كەم بووەتەوە...

ئایەتەکـە بـە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ تـەواوکراوە، چـونکە بەڕاستی تەنها ئەو کەسانە لە ئایەتەکە تێدەگەن کە بیردەکەنەوە.

## سوودەکانی شەو و ڕۆژ

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ یـونس/٦٧، واتـە: هەر زاتی خوایە کە شەوی بۆ بەدیهێناون تاکو تیایدا بحەوێنـەوە، ڕۆژیشـی کردووە بە ڕووناککەرەوە (تا کار و کاسپی تێدا ئەنجام بدەن) بەڕاسـتی ئـا لەو دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك ببیستن و تێبگەن.

زانسـتی نـویێ ئاشـکرایکردوە کـە کـارکردنی ڕۆژ کۆمـەڵێك سـوودی تەندروستی هەیە. بەتایبەت گەر کارکردنەکە لە سەرەتای ڕۆژەکانـدا بێـت، چونکە کرێکار لە بەیانی زوودا تیشـکی خـۆری بەردەکـەوێت کـە لەوکاتـەدا دەوڵەمەنـدە بـە تیشـکی سەرووەنەوشـەیی، ئـەم تیشـکە ڤیتـامین (D) دروستدەکات و زیندویەتی و چالاکی بە جەستە دەبەخشـێت و ئێسـکەکان پتەو دەکات.

زانستی نویێ سەلماندوویەتی، بەرزترین ڕێژەی گازی ئۆزۆن لە کەشدا لە دەمی بەرەبەیاندا دەبێت، لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا ڕێژەی ئۆزۆن کەم دەکات و بـەرەو نـەمان دەچـێت. ئـەم گـازە کاریگەرییـەکی بەسـوودی هەیـە بـۆ

کۆئەنـدامی دەمـار و چـالاککردنی کـرداره هـزری و ماسـولکەییەکان لـە بەرەبەیاندا.

سـەلمێنراوە بـەرزترین ڕێـژەی کـۆرتیزۆن لـە خوێنـدا لـەکاتی بەرەبەیاندایە... ئەم ماددەیە کاردەکاتە سەر زیادکردنی چالاکییەکانی جەستە و پترکردنی ڕێژەی شەکر لە خوێندا، دیسانەوە ئەمیش وزە بە جەستە دەدات... هەر لەبەرئەمەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) کە نوێژی بەیانی ئەنجام دەدا لە شوێنی نوێژەکەیدا تاکو خۆرهەڵاتن دادەنیشت.

ئەمە و لەلایەکی ترەوە، زانایانی بواری پزیشکی جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە سوودەکانی خەوتن لە شەودا بە چەندین هێند زیاترە لە سوودەکانی خەو لە ڕۆژدا.

ڕژێنی سنەوبەری لـە مێشـکدا مـاددەی میلاتـۆنین دەردەدات، دەردانـی ئەم ماددەیە لەتاریکیدا زیاددەکات و لە ڕووناکیشدا زۆر کـەم دەبێتـەوە... بینراویشە ماددەی میلاتۆنین کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر خەوتن هەیە.

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾الروم/٢٣، واتـە: یـەکێك لـە نیشـانە و بەڵگـەکانی خـوای گـەورە خەوتنتانـە لـە شـەو و ڕۆژدا، لـەکاتی بێداریشـدا هـەوڵ و کۆششتانە بۆ بەهرەوەرگرتن لە بەخششەکانی خـوا، جا بەڕاستی ئـا لـەو دیاردەیەشـدا بەڵگـە و نیشـانەی زۆر هـەن بـۆ کەسـانێك کـە دەبیسـتن و تێدەگەن.

ڕژێنی سنەوبەری کە لە تاریکیدا چالاك دەبێت، پەستانی خوێن بە بـڕی (١٥–٢٠ملم) دادەبەزێنێت و هەندێك لە قورسـی و ماندوویەتییـەکان لەسـەر دڵ کەم دەکاتەوە.

زینــدەوەران بــە شــەو دەخــەون، گــەڵاكان بەشــەو دەخــەون، گــەڵاكانی ڕووەكی (الترمس) بە ڕۆژ ئاسۆیین و بە شەو بەرەو خوارەوە شۆڕدەبنەوە و پاشـانیش لـە بەیانیانـدا دەگەڕێنـەوە حاڵـەتی پێشـوویان... هـەروەها پێكەیشتنی گوڵ كە بەرهەم دەدات دیسانەوە لە شەودا دەبێت، لەوكاتـەدا ئەندازەیەك پشوو دەدات.

لە وڵاتی یابان خاوەنی كێڵگەیەكی بـرنج (مـەرەزە) سـكاڵانامەیەكی لـە دژی یـەكێك لـە كۆمپانیاكـان پێشكەشـكرد، بەرامبـەر بـەوەی كۆمپانیاكـە تابلۆیەكی پڕوپاگەندەی ڕووناكی لە ناوەڕاستی كێڵگەكـەی ئەمـدا دانـابوو. باخەوانەكـە تێبینـی كردبـوو كـە برنجەكـەی وشـك دەبێـت و دەمرێـت و بەروبوومەكەشی زۆر كەمترە لەوەی پێشتر هەیبووە. بۆیە داوای قەرەبووی لە كۆمپانیاكە كـرد. كاتێـك بـۆ سـەلماندنی ڕاسـتی داواكـاریی باخەوانەكـە لێكۆڵینـەوە كـرا، بینـرا داواكارییەكـەی لـەجێی خۆیدایـە و ئـەو ڕاسـتیەش سـەلمێنرا كـە تـابلۆ ڕووناكەكـە لـە شـەودا (كـە مـاوەی پشـووە) پشـووی ڕووەكەكانی تێكداوە.

# بەرەبەیان هەناسە دەدات

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾التكــوير/١٥-١٩، واتـــە: سوێند بەو ئەستێرانەی پەنهان دەبن و لەچاو ون دەبن، بەو هەسارانەی پەنا دەگرن و دیارنامێنن، بەو شەوەی دادێت و تاریکاییەکەی ڕوومان تێدەکات، بە بەرەبەیان کە پشووی تێدێت، وەکو زیندەوەرێك ئاهی تێدێتەوە و دەستدەکات بە هەناسەدان و ژیان و ڕووناکیەکەی دەردەکەوێت.

خوای گەورە سوێند دەخوات ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾، لێرەدا (وَ) بۆ سوێندە، ئەوەش دەزانین زاتی مەزن تەنها سوێند بە شتە مەزنەکان دەخوات، بۆیە پەروەردگار لەم ئایەتەدا سوێند بە (بەرەبەیان) دەخوات کە (هەناسەدەدات)... لەم دەستەواژەیەدا خوای گەورە کرداری دەستپێکردنی دەرکەوتنی خۆر لە بەرەبەیاندا بە مرۆڤێك دەچوێنێت کە دەست بەهەناسەدان دەکات، واتە وەرگرتنەوەی هەوا لەدوای پشوویەك، وەستانێکی کاتی لەدوای هەناسەدانەوە.

هەروەك دەشزانین کرداری هەناسەدان لە گرنگترین کردارە ژیانییەکانە کە زیندەوەران پێیهەڵدەستن بەشێوەیەك کە مرۆڤ لەڕێی ئەم کردارەوە هەوای دەوڵەمەند بە ئۆکسجین بۆ سییەکان دەنێرێت (هەناسەوەرگرتن)،

سییەکانیش ئۆکسجین وەردەگرن و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دردەکەنە دەرەوە... ئەم کردارە بۆ لەشی مرۆڤ کردارێکی زۆر گرنگ و بەبایەخە و هەرگیز هیچ مرۆڤێك ناتوانێت لە چەند خولەکێك پتر هەناسەنەدات. وەستانی کرداری هەناسەدان هێنانی مەرگێکی حەتمیە... لەش سوود لە ئۆکسجین وەردەگرێت بۆ سوتاندنی خۆراك و بەرهەمهێنانی ئەو وزەیەی ژیان لە خانە و شانەکانی لەشدا نوێدەکاتەوە.

لە بەرەبەیاندا و لەسەرەتای دەرکەوتنی خۆر (بەیانی)دا، کردارێکی بایەخدار و ئاڵۆز ڕوودەدات ئەویش کرداری ڕۆشنەپێکهاتنە، تیایدا ڕووەکە سەوزەکان گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی هەوا وەردەگرن (ئەو گازەی بۆ مرۆڤ زیانبەخشە و لە کرداری هەناسەداندا دەریدەکاتە دەرەوی لەشی خۆی)... ڕووەك لەجیاتی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کە وەریدەگرێت، گازی ئۆکسجین دەکاتە هەواوە.... واتە ئۆکسجین کە بەهۆیەوە هەناسە دەدەین و سەرچاوەی سەرەکی ژیانە، بەرهەمێکی سەرەکی کرداری ڕۆشنەپێکهاتنە.

ڕێژەی (٣٠٪)ی ئەو ئۆکسجینەی لە هەوادایە ڕووەکەکانی سەر زەوی بەرهەمی دێنن، (٧٠٪)کەی تریشی ئەو ڕووەك و زیندەوەرە تاك خانانە بەرهەمی دێنن کە لە دەریا و زەریاکاندا هەن... ئەم کردارە تەنها بە چاوی ئاسایی نابینرێت، چونکە لەم میکانیزمەدا ئەلیکترۆن و گەرد و گەردیلەکان بەکاردەهێنرێن، بەڵام دەتوانین بەرهەمەکانی کرداری ڕۆشنەپێکهاتن ببینین لەڕێی ئەو ئۆکسجینەوە کە وامان لێدەکات توانای هەناسەدان و سوود وەرگرتن لەخۆراکمان هەبێت کە پارێزگاری لە ژیانمان دەکەن.

ڕۆشنەپێکهاتن سیستمێکی ئاڵۆزە و ماددەی کیمیایی و یەکەی کێش بەکاردەهێنێت، ئامادەباشی ورد و هەستیاری لەخۆدەگرێت، ملیۆنان

ملیۆن تاقیگەی کیمیایی هەن لە هەموو ڕووەکە سەوزەکاندا بەم کرداره هەڵدەستن... ڕووەکەکان ئەو ئۆکسجینە بەرهەم دەهێنن کە هەڵیدەمژین و ئەو خۆراکانەی دەیانخۆین و وزەیان لێوەردەگرین، ئەم کرداره ملیۆنان ساڵە بەردەوامە.

دەستەواژەی ﴿إِذَا تَنَفَّسَ﴾ بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر کرداری ڕۆشنەپێکهاتن کەخوای گەورە بەرەبەیانی (کە سەرەتای هەڵاتنی خۆرە لە ئاسۆوە) چواندوویەتی بە مرۆڤێك کاتێك هەناسە دەدات، ئەوەش ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ پێویستی پێکەوەبوونی بەرهەمهێنانی ئۆکسجین لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا، دەستپێکردنی ئەم کرداری هەناسەدانە ژیانیە یاخود ڕۆشنەپێکهاتنە، لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا دەستپێدەکات.

گرنگی ئەو دیاردەیە بەو شێوەیە دەردەکەوێت کە خوای گەورە سوێندی پێدەخوات و ئەو ڕێگایەی خوای گەورە بۆ کرداری ڕۆشنەپێکهاتن دیاریکردووە.

ئاماژەدان بەم دیاردەیە (ڕۆشنەپێکهاتن) و چواندنی بە هەناسەدان بەڵگەیە لەسەر گرنگی و بایەخی ئەو کرداره وەك بایەخی هەناسەدان بۆ مرۆڤ، زەوی ناتوانێت واز لەم کرداره بێنێت، چونکە بەبێ ڕۆشنەپێکهاتن زەوی دەگۆڕێت بۆ خەرابات و ژیانی تێدا نابێت (وەك مانگ).

هەروەها بەکارهێنانی (إِذَا) لە ئایەتەکەدا بەڵگەیە لەسەر پێویستی دەستپێکردنی کرداری ڕۆشنەپێکهاتن لەگەڵ هەڵاتنی خۆر، ڕیزبەندی وشەکانی ئایەتەکەش کە خوای گەورە هەڵاتنی خۆری باسکردووە لە سەرەتادا پاشان دەستپێکردنی کرداری هەناسەدان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك، ئەوەش هاوتایە لەگەڵ کرداری ڕۆشنەپێکهاتن و بەرهەمهێنانی ڕووناکی، بەبێ ئەم ڕیزبەندیە ناکرێت کرداری هەناسەدانی زیندویی ڕووەك

یاخود کرداری ڕۆشنەپێکهاتن و پاشان بەرهەمهێنانی ئۆکسجین ئەنجام بدرێت.

سەرنجێکی نایاب لەمبارەیەوە هەیە، کاتێک منداڵ لەدایک دەبێت لەکاتی گریانیدا دەست بە هەناسەوەرگرتن دەکات، هەناسەدان سەرەتای ژیانیەتی، هەروەها بەرەبەیانیش لەدایک دەبێت و دەست بە هەناسەدان دەکات.

کرداری ڕۆشنەپێکهاتن کە ڕووەکەکان پێی هەڵدەستن، هەندێجاریش بەکتریا و زیندەوە تاک خانەکانیش پێی هەڵدەستن، تیشکی خۆر بەکاردێنێت بۆئەوەی شەکر بەهەم بێنێت (کاربۆهێدرات) لە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئاو و وەك بەرەنجامێکی ئەم هاوکێشەیە وزەی تیشکی خۆر لەنێو شەکری بەرهەمهاتوودا زەخیرە دەبێت...

# نزمترین ناوچە لەسەر ڕوی زەوی

خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ الروم/١-٥، واتە: ألم (خوای گەورە زاناترە بە ماناکانیان)، ڕۆمەکان شکستیان خوارد (بەدەستی فارسەکان)، لەشوێنێکی نزیکەوە (یان نزمەوە)، ئەوانە (ڕۆمەکان) دوای شکستیان سەردەکەون (بەسەر فارسەکاندا)، لەچەند ساڵێکدا، هەموو کار و فرمانێك تەنها بەدەست خوایە، لەوەوپێش و لەوەودواش، جا ئەو ڕۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ دەبن بە سەرکەوتنی خوا (کە بە ڕۆمەکانی بەخشی)، هەرکەسێك ئەو بیەوێت، سەری دەخات و ئەو (خوایە) خاوەن دەسەلاتی بێسنوورە و زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە.

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتانە ڕوودانی جەنگە لەنێوان هەردوو شانشینی فارس و ڕۆم لە ناوچەی نزیك دەریای مردوودا کە فارسەکان تیایدا سەرکەوتن. ئەمەش لەساڵی ٦١٩ی زاینیدا بووە.

موسڵمانان بەهۆی تێکشکاندنی ڕۆمەکانەوە توشی خەم و بێتاقەتی بوون، چونکە ڕۆمەکان ئەهلی کیتاب و خاوەنی ئاینی ئاسمانی بوون، لەکاتێکدا فارسەکان ئاگرپەرست بوون، بۆیە خوای گەورە پەیمان بە موسڵمانان دەدات فارسەکان لەجەنگی دووەمدا و لەدوای تێپەڕبوونی چەند

ساڵێك شكست دێنن لە بەرامبەر ڕۆمەكاندا و سەركەوتنی ڕۆمەكانیش هاوكاتی سەركەوتنی موسڵمانان دەبێت بەسەر بێباوەڕەكاندا.

(بضع سنين) یش (لەئایەتەكەدا) وەك شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: ژمارەیەكە لەنێوان پێنج و حەوت یان یەك و نۆ.

لەدوای حەوت ساڵەوە واتە لەو ماوەیەی پێشتر قورئانی پیرۆز دیاری كردبوو، پەیمانەكە هاتەجێ. لەساڵی ٦٢٦ی زاینیدا جەنگێكی تر لەنێوان فارس و ڕۆمەكاندا ڕوویدا و تێیدا ڕۆمەكان سەركەوتن و ئەم سەركەوتنەش هاوكاتی سەركەوتنی موسڵمانان بوو بەسەر بێباوەڕەكانی قوڕەیشدا لەجەنگی بەدری گەورەدا.

ئایەتەكە وەسفی مەیدانی جەنگی یەكەمی نێوان فارسەكان و ڕۆمەكانی كردووە، بەوەی ئەو جێگەیە (أدنى الأرض)ـە، واتە نزمترن ناوچەی سەر زەوی:

جێگای ئەو جەنگە (ناوچەی نزیك دەریای مردوو) نزمترە لەئاستی ڕووی دەریا بە (٣٩٢ مەتر)، ئەمەش نزمترین خاڵە لەسەر وشكانی كە مانگە دەستكردەكان تۆماریان كردووە.

لە ئینسایكلۆپیدیای بەرتانیدا هاتووە: "دەریای مردوو، پارچەیەكی ئاویی خوێدارە و لەنێوان ئیسرائیل و ئەردەندایە، نزمترین پێكهاتەی ئاوییە لەسەر زەوی و نزمیەكەشی دەگاتە نزیكەی (١٣١٢ پێ) (واتە دەوروبەری ٤٠٠ مەتر) لەئاستی ڕووی دەریاوە. بەشی باكوری دەكەوێتە ئەردەنەوە و بەشی باشوریش دابەشبووە لەنێوان ئەردەن و ئیسرائیلدا".

ئەم زانیارییەش زیاتر ڕاستێتی ئایەتە پیرۆزەكە دەسەلمێنێت... پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾.

# درز و کەلێنی زەوی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ﴾الطارق/١٢، واتـە: سـوێند بە زەوی کە درزی تێدایە.

زانایان ئاشکرایان کرد ئەم زەوییەی لەسەری دەژین بـەرگێکی بـەردینی دەرەکی هەیە، ئەم بەرگەش بە تۆڕێکی گەورەی درز و کەلێن پەرتبووە بـە درێـژایی سـەدان کیلۆمـەتری درێـژی و پـانی. بـەقولایی (٦٥–١٥٠کـم) ی درێژی و پانی.

جێی باسە ئەو درز و کەلێنانە پێکەوە پەیوەستن، بەشێوەیەك کـە وەك ئەوە دەردەکەون تەنها یەك درزی درێژبووەوە بن.

ئەم درز و کەلێنە لە پێویستییەکانی شیاوێتی زەوییە بۆ ئاوەدانی، درز و کـەلێنی بـەرگی بـەردینی زەوی، درزێکـی ئاسـایی نییـە، بـەڵکو پیایـدا جوڵەیەکی ستونی یان ئاسۆیی بەشێك لە بـەرگی بـەردین دروسـت دەبێـت. لەلایـەکی تریشـەوە زەوی ژمارەیـەك تـوخمی تیشـکدەری تێدایـە کـە خودکاریانـە بـەتێکڕایی دیـاریکراو شـیدەبنەوە، ئـەم شـیبوونەوەیەش دەبێتەهۆی بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆرگەرمی. خۆئەگەر ئەم بـڕە گـەرمییـەی زەوی خاڵی نەبێتەوە، ئەودەمە زەوی هـەر لـە یەکـەمین سـاتی ڕەقبـوونی توێکڵەکەیدا وەك بۆمبێکی ئەتۆمی دەتەقیەوە.

# خۆرهەڵات و خۆرئاواکان

دیاردەیەکی ڕۆژانە هەیە لەودەمەی خۆر و زەوی دروستبوون ئەویش بەردەوامە، دیاردەی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون... لە قورئانی پیرۆزدا بە سێ وێنە و دەستەواژەی جیاواز هاتووە. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾المزمل/٩، واتە: ئەو زاتەی تۆی ڕەوانە کردووە: خاوەن و پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاوایە، جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە فەرمانی بەدەست بێت، کەواتە هەر ئەو بکە بە پشتیوانی خۆت و داوای یارمەتی هەر لەو بکە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾الرحمن/١٧، واتە: خوا خاوەنی هەر دوو خۆرهەڵات و هەر دوو خۆرئاوایە.

یاخود دەفەرموێت: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾المعارج/٤٠-٤١، واتە: جا سوێند بە پەروەردگاری خۆرهەڵاتەکان و خۆرئاواکان، بەڕاستی ئێمە هەمیشە بەدەسەڵاتین لەسەر ئەمانە و لەناوبەرین و کەسانی چاکتر بهێنینە کایەوە، ئێمە بۆ ئەو مەبەستە بێتوانا نین.

لە ئایەتی یەکەمدا باس لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا بە دەستەواژەی تاک کراوە، لە دووەمدا بە جووت و لە سێیەمیشدا بە کۆ، ئاخۆ دەبێت هۆی ئەم جیاوازی دەربڕینانە چی بێت؟ ئایا ئەو خۆرهەڵات و خۆرئاوایانە

لەکوێن؟

گران نییە لە دەربڕینی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بە دەربڕینی تاك تێبگەین، لەکوێ بین و چۆن بوەستین هەر خۆرهەڵاتێك و خۆرئاوایەك دەبینین.

دوو خۆرهەڵات و دوو خۆرئاوا... ڕاڤەکارانی قورئان بە دوو خۆرهەڵات و دوو خۆرئاوای داناوە لە زستان و هاویندا. وەك زانراوە زەوی سوڕی خۆی بە دەوری زەویدا بە (٣٦٥ ڕۆژ) تەواو دەکات، هەروەها لاریی تەوەرەی خولانەوەی لە تەوەرەی ستونی دەبێتەهۆی جیاوازی وەرزەکان و جیاوازی شوێن و کاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون لەسەر زەوی بە درێژایی ساڵ.

لەڕاستیدا خۆرهەڵات و خۆرئاوای سەر زەوی –واتە شوێنی خۆرهەڵاتن‌و خۆرئاوابوون– هەموو ڕۆژێك کەمێك دەگۆڕێن، واتە خۆر هەموو ڕۆژێك لە شوێنێکی جیاوازەوە هەڵدێت و ئاوا دەبێت (بە درێژایی ساڵ)، ئەوەش بەپێی خۆی واتە بوونی ژمارەیەك خۆرهەڵات و خۆرئاوابوون بە ئەندازەی ڕۆژەکانی ساڵ و نەك تەنها دوو خۆرهەڵاتن و دوو خۆرئاوابوون... گەرچی جیاوازی نێوان خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوونی لە زستان و هاویندا جیاوازییەکی ئاشکرا و ڕشوون هەیە.

کەواتە دوو خۆرهەڵات و دوو خۆرئاوا لە زستان و هاویندا مەبەستی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾... ئەو خۆرهەڵات و خۆرئاوابوونە زەوەندانەش بە درێژایی ساڵ دەیانبینین مەبەستی ئایەتی سێیەم دەبێت ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ﴾، هەروەها مەبەستی خۆرهەڵات و خۆرئاوابوونی ناوچە جیاوازەکانیش دەگرێتەوە بەوپێیەی خۆرهەڵات و ئاوابوونی کردارێکی یەکبینە و بەردەوامە، لەهەر ساتێکدا خۆر لە ناوچەیەکدا هەڵدێت و بەگوێرەی ناوچەیەکی ترەوە خۆرئاوبوون دەبێت.

# جیاوازی ساڵی هەتاوی و ساڵی مانگی

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَبِثُواْ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا﴾الكهف/٢٥، واتە: یارانی ئەشکەوت سێ سەد ساڵی تەواوی (هەتاوی) لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە (ئەگەر بە ساڵی مانگی حسابی بکەین) نۆ ساڵی تریشیان خستە سەر (واتە دەکاتە سێ سەد و نۆ ساڵ خەویان لێکەوت).

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی تێدایە کە (٣٠٠ ساڵی هەتاوی) بەرامبەرە بە (٣٠٩ ساڵی مانگی) بەگوێرەی دانیشتوانی زەوییەوە، بەوەش ئایەتەکە پێشڕەفتی هەیە لە زانستی گەردوونناسی و حسابە فەلەکییەکاندا، لەبەرئەوەش کە حسابکردنەکە ڕێژەییە و ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُواْ﴾الكهف/٢٦، واتە: (پێیان بڵێ): خوا خۆی دەزانێت بەماوەی مانەوەیان لە ئەشکەوتەکەدا. ئەمەش مانای وایە ژمارەی ساڵەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری ئەم گەردوونە پڕ لە جوڵەیە دەگۆڕێت. بەپێی جیاوازی شوێن و چاودێر و چاودێریکراو، کات دەگۆڕێت، کەس نایزانێت تەنها خوای مەزن و بەدەسەڵات نەبێت.

بیردۆزی ڕێژەیی ئەنیشتاین ڕوونیکردووەتەوە کە کات بەبێ شوێن بوونی نییە، شوێنیش بەبێ کات بوونی نییە. بەوپێیە ڕابردوو و ئێستا و داهاتووە تەنها لەو چوارچێوەیەدا دەچەسپێت کە تێیدا دەژین، واتە لەسەر زەوی. ڕووداوە گەردوونییەکان کە لەم ساتەدا لە ئاسماندا

دەیانبینین، مانای وەها نییە هەر ئێستا ڕوودەدەن، بەڵکو لە ڕابردوویەکی دووردا ڕوویان داوە.

کە ئەستێرەیەك لە ئاسماندا دەمرێت یان دەتەقێتەوە، مرۆڤ لەسەر زەوی نایزانێت تەنها لەڕێی پەیامێکی ڕووناکییەوە نەبێت کە ڕەنگە هەزاران یاخود ملیۆنان بەڵکو بلیۆنان ساڵ دواتر پێیبگات (بە حسابی ساڵەکانی سەر زەوی)، ئەم پەیامە ڕووناکییە ئەوکاتە درێژە دەخایەنێت، گەرچی خێراییەکی زۆریشی هەیە.

## زەوی زەلیل و ملکەچە

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ﴾الملك/١٥، واتە: هەر ئەو زاتەیە زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون، بگەڕێن بە هەموو گۆشە و کەناریدا، لەو ڕزق و ڕۆزییەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات، دڵنیاش بن سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە.

ئەم زەوییەی بەجێگیری و چەسپاوی دەبینرێت وێکچووی ئاژەڵێکی جوڵاوی ملکەچە کە ئەوانەی سەرپشتی فڕێ ناداتە خوارەوە، وێڕای ئەوەش کە بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە بەخێرایی (١٠٠٠ میل) لەکاتژمێرێکدا. بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە بەخێرایی (٦٥٠٠میل) لە

کاتژمێرێکـــدا، پاشـــان زەوی و کۆمەڵـــەی خـــۆر بـــەتێکڕایی (٢٠ میـــل) لەکاتژمێرێکدا لەجوڵەدان.

لـە دیـاردە زانسـتیەکانی زەلیلبـوونی زەوی بـۆ مـرۆڤ، بـوونی هێـزی کێشکردنی زەوییە لەسەر ڕووەکەی کە مرۆڤ و بەدیهێنراوانی تری سەری بۆخۆی کێشدەکات. گەر هێزی کێشکردنی نەبوایە، ئەوکاتە شتگەلێك لەسەر ڕووی زەوی ڕوویاندەدا، لەوانە:

١. تەنەکان لەسەر ڕووی زەوی کێشیان نەدەبوو، ئەوەش دەبوە هۆی فرینـی ئـەو شـتانە لەسـەر ڕووی زەوییـەوە بـەرەو ئاسمـان و هـەرگیز نەدەگەڕانەوە.

٢. هەوا و بەرگەهەوای پارێزەر نەدەمان، باران و هەور و دەریا و ڕووبار و ئاژەڵان دەڕۆیشتن، ژیان لەسەر زەوی کۆتایی پێدەهات.

خوای گەورە زەویی زەلیل کردووە بەوەی شاخی تێدا بونیاتنـاوە، بۆ هەموو شاخێکیش ڕەگێکـی دروستکردووە کە بەقوڵایی زەویدا ڕۆچووە تاکو کیشوەرەکان جێگیر و چەسپاو بکات و لە جوڵە و لەرینـەوەی بخـات، ئەو کێشکردنەش وەهای لە زەوی کردووە بەدەوری خۆردا بسوڕێتەوە.

# شاخەکان و باران بارین

خوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا﴾المرسلات/٢٧، واتە: هەروەها لەسـەر گۆی زەوی کێـوی لوتکـە بڵنـدمان دامەزراندووە و ئای سازگارمان پێشکەش کردوون بۆ خواردنەوە...

پەروەردگار ئاماژە بە بوونی پەیوەندی دەکـات لـەنێوان شـاخی بـەرز و دروسـتبوونی هـەورەکان و دابـارینی ئـاوی شـیرین لێیانـەوە. ئـەوەش بـە باسکردنی شاخ هاوڕێ لەگەڵ ئەو ئاوەی لە هەورەکانەوە دادەبارێت.

زانستی نوێ دەڵێت: "گرنگترین فاکتەرە سروشتیەکانی ساردکردنەوەی هەوای کەش بریتییە لـە بـا و شـاخەکان. شـاخە لوتکـە بەرزەکان لـەکاتی بەرەنگاربوونـەوەی (بـا)ی ئاسـۆیی پەسـتان نـزم، ناچـاری دەکـات بـۆ سـەرەوەی کـەش بەرزبێتـەوە، بـەوەش هـەڵمی ئاوەکـەی کـە تێیـدا سـاردەبێت و چـڕدەبێتەوە بـۆ دروسـتبوونی هـەور، لوتکـەی شـاخە بەرزەکانیش هەورەکان سارددەکەنەوە و کاردەکەنـە سـەر چڕکردنەوەی و دابارینی باران لێیەوە.

لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هەردوو باسی (شاخی دامەزراو) و (ئاوی سـازگار) بەدواییەکدا هاتوون، وەك ئاماژەیەك بەوەی لەنێوانیاندا پەیوەندی هەیە... لوتکەی بەرزی چیاکان ڕۆڵی گەورەیان هەیە لە دابـارینی ئـاوی سـازگار بـۆ

مـرۆڤ، کشــتوکاڵ و ئــاژەڵان، ئـەوەش زانایـانی جوگرافیـای سروشـتی و چاودێریی قەناعەتی تەواویان پێیەتی.

لـە زانیارییــە گشــتییەکان ئەوەیــە کــە سەرچــاوەی ڕووبارەکــان لــە شاخەکانەوەیە و ئاوی سازگار –واتە شیرین– سەرەتا بەڵگەی ئاوی بارانە، بەڵام ئەوەی لە ئایەتەکەدا بە نەناسراو (نکرة) هـاتووە، مانـای گشـتیبوون دەگەیـەنێت، ئـەوەش هـەموو ئـاوی شـیرینی زەوی دەگرێتـەوە، جا ئـای ڕووبار بێت یان بیر یاخود باران... لەڕاستیدا باران لە ئـاوی ڕووبـار و ئـاوی شــیرینی سەرچــاوەکانەوە دروســتبووە، ئــاوی دەریــا و زەریاکــان بــە بەردەوامی دەبنە هەڵم، پێبەپێی سوننەتی خودایی لە بەهەڵمبوونی ئاو لـە بارودۆخــە جیاوازەکانــەوە، لــە ســورِێکدا کــە ژیــانی ســەر زەوی لەســەر دەوەستێت بێئەوەی کەمێکیش لەئاوی شیرین لەناوبچێت.

وەسفی شاخەکان بە لوتکەبەرز (شـامخات) لـە ئایەتەکانـدا ڕاستییەکی تــر و دیاردەیــەکی ســەرنجڕاکێش دەردەخــات، ئــەویش دیــاردەی بــەفری هەمیشەییە بە لوتکەی هەموو شاخەکانەوە، کە پلەی گەرمی لە لوتکەکاندا هەمیشە لـەژێر سفرەوە دەبێـت (ئەگـەر بەرزییەکـەی لەسـەروو ڕادەیـەکی دیــاریکراوەوە بێــت) ئــەوەش بەنــدە لەســەر شــوێنەکەی لەســەر هێڵــی یەکسـانی، زۆرتـرین بـەرزی دەسـتپێکردنی ناوچـەی بـەفر، یـاخود (هێڵـی بەفری هەمیشەیی) وەك ناسراوە.

جێی ئاماژەپێدانـە کـە خـودی شـاخەکان خۆیـان بـەهۆی ئـەمبارکردنی ئاوی بەفر و بارانەوە دەبنە سەرچاوە بۆ ئاوی ژێر زەوی و کانیاوەکان.

# کرداری داماڵین شاخەکانی بۆ تەختانی و دەشت گۆڕیوە

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾البقرة/٢٢، واتە: ئەو زاتـە (الله) زەوی کـردووە بـە فـەرش و جێگـای نیشتەجێبوون و ژیان بۆتان.

یـان دەفـەرموێت: ﴿وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَٰهَا فَنِعْمَ ٱلْمَٰهِدُونَ﴾الذاريات/٤٨، واتـە: زەویشـمان ڕاخسـتووە (ژیانمـان لەسـەری ئاسـانکردووە) بەڕاسـتی خـوا زاتێکی کارساز و کاربەجێیە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾نوح/١٩-٢٠، واتە: هەر خوا زەوی بـۆ ڕاخسـتوون، تـا (بـە ئـارەزووی خۆتان) پیایدا بگەڕێن لە ڕێگا فراوانەکاندا.

ئایەتـە پیرۆزەکـان ئامـاژە بـەوە دەدەن کـە بەشـێکی تـەنکی تـوێکڵی زەوی خوای گەورە سازاندوویەتی تاکو دروست و شیاو بێت بۆ ژیانی ئاژەڵ و ڕووەك و ئامادەییـەك بـۆ پێشـوازی لـە مـرۆڤ... لەڕاسـتیدا لێکۆڵینـەوە زانستیەکان بەتەواوی هاوتای ئایەتە پیرۆزەکانن.

زانایان دەڵێن: توێکڵی زەوی لەدوای ئەوەی بارستەیەکی ئاگرین بـووە، لەدوای تێپەڕبوونی ملیۆنان ساڵ گۆڕاوە بـۆ چینێکی ڕەقبـوو کـە بـەرز و نزمـی قـووڵی هـەبووە، پاشـان فاکتـەرەکانی دامـاڵین (تعريـة) هـات و شاخەکانی گۆڕی بۆ گرد و بۆ دەشت و ڕێڕەو و جۆرگـەلی جیـاوازی خـاك و شیاو و گونجاو بۆ مانەوەی مرۆڤ و ئاژەڵان لەسەری.

# پێشبینی قورئانی پیرۆز بە هۆکارەکانی گەیاندن

قورئـانی پـیرۆز پێشـبینی ئـامێری تەلـەفۆن و ئـامێری نـاردن (کـە پێیـدەوترێت ڕادیـۆ) کـردووە.. هـەروەها پێشـبینی تەلـەگراف و تلفـاز کـە پێیـدەوترێت تەلـەفزیۆن... ئـەم داهێنانـە زانسـتیانە کاریگـەری گـەورە و بەرچاویان هەیە لـە ژیـانی مرۆڤـدا، بـەڵکو بوونەتـە بەشـێکی سـەرەکی لـە چالاکی و جوڵەی ڕۆژانەی ژیانی مرۆڤ.

خوای گەورە لە قورئانی پـیرۆزدا دەفـەرموێت: ﴿وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾سبأ/٥٣، واتە: هەر لـە دوورەوە باسـی نهێنی و شـاراوەکانیان دەکرد و دەمیان لێدەدا.

ئایەتەکــە مانــای نامــەکانی فاکســیش لــە خۆدەگرێــت، کــە لــە چاوتروکاندنێکدا بۆ دوورترین وڵات دەگوێزرێتەوە.

# پێشبینیکردنی قورئانی پیرۆز بەهۆکارە نوێیەکانی گواستنەوە

زۆرێك لە ئیعجازە قورئانییەکان لای کەسە پێشینەکان نادیار و نـەزانراو بـووە، لەگـەڵ ئـەوەش بـاوەڕی تـەواویان پێیـان هـەبووە و لێکدانـەوە و شیکردنەوە و تێگەیشتنیان لە ماناکانیان بۆ پـەروەردگار بەجێهێشـتووە. هەرچەند هەوڵی تەواویان داوە تاکو تەواو لە ماناکانیان تێبگەن، توانیویانە هەندێك لە ئایەتە ئیعجازییەکان بە گومانی زیاتر قبوڵکراو، لێکبدەنەوە، کە هێشتا نەگەیشتووەتە پلەی دڵنیایی تەواو (یەقین)، چونکە دڵنیـایی تـەواو پێویستی بە یەکلاکردنەوە و بڕینەوە هەیە کە هیچ نکوڵیەکی تێنەکەوێت.

یەکێك لەو غەیبیانەی قورئانی پیرۆز هـەواڵی لـەبارەوە دەدات، هۆکـارە نوێیـەکانی گواسـتنەوەیە، وەك لـە ئایەتێکـدا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ﴾ یس/٤١-٤٢، واتـە: بەڵگـە و نیشـانەیەك (لـە هێـز و دەسـەڵاتمان) ئەوەیە کە ئێمە نەوەکانیانمان لە کەشتییەکدا هەڵگرت هـەروەها کەشتی و هۆکاری تری هاتوچۆی لە وێنەی ئەو بۆ سازاندووون.

مەبەست لە ﴿مَا يَرْكَبُونَ﴾ لە ئایەتەکەدا، ئەو هۆکارانەیە کە بەهۆیەوە لە وشکانیدا پێی دەگوێزرێنەوە ئەوەی وەك کەشتی وەهایـە، وەك ئۆتۆمبێلـە

گوێزەرەوە گەورەکان کە ژمارەیەکی زۆر زۆر لەخەڵکی و پێداویستیەکانیان هەڵدەگرن.

هـەروەها ئـەو ئایەتـەی دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾التكوير/٤، واتە: کاتێك وشترانی ئاوس کە تەمەنی بارداریان دەمانگە گوێیان پێنەدرا.

مانای ئایەتەکە بەمجۆرەیە، ڕۆژێـك دێت (عِشـار) گرنگـی نامێنێت بـۆ گواستنەوە و سوود وەردەگیرێت لـە فڕۆکـە و شـەمەندەفەر و ئوتۆمبێـل و دۆزینەوەکانی سەردەم و جگەلەوانەش لە هۆکارەکانی گواستنەوە..

# گەشەکردنی هۆیەکانی گواستنەوە

قورئانی پیرۆز لە سەردەمێکدا هاتووەتە خـوارەوە کـە تیایـدا مـرۆڤ بـۆ گواسـتنەوە و پەیوەنـدیکردن پشـتی بەسـتووە بـە هۆکـارە سـەرەتایی و سادەکان بەشێوەیەك کە زیاتر نەبووە لە بەکارهێنانی ئاژەڵ، لەکاتێکدا بۆ پەیوەندیکردن پشت دەبەسترا بە کۆتری نامەبـەر یـاخود نـاردنی هـەواڵ و نامـە بـە کەسـێکدا، ئـەو کەسـەش بۆگەشـتەکەی دیسـانەوە ئـاژەڵی بـەکاردەهێنا... هـەروەها ناوەنـدەکانی گواسـتنەوەی دەریـایی کـە زیـاتر بەهۆی بەکارهێنانی چارۆکەوە دەبـوو (بـا) پـاڵی پێـوە دەنێـت و بـەوەش دەجوڵێت.

لـەو سـەردەمەدا قورئـان دابـەزی و پێغەمبـەر (ﷺ) هـات تـا بـاس لـە داهاتوویەك بکات گۆڕانکاری لەو هۆکارانەی گواستنەوەدا ڕوودەدات کـە تـا ئەو کاتە ناسـرابوون، وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت (لَتَـركَبُنَّ القُـلاصَ

فلایسعی علیها) ئێوە واز لە (قُلاص) دەهێنن کە ناتوانرێت هـەوڵی لەسـەر بدرێت... لێرەدا مەبەست لە (قُلاص) وشترە.

لـە سـەردەمێکدا کـە وشـتر هۆکـاری گواسـتنەوە بـوو، قورئـانی پـیرۆز دابەزی تا بەخەڵکی ڕابگەیەنێت ئەو هۆکارانەی گواستنەوە کە هەیانە، تەنها چـەند هۆکـارێکی زۆر سـەرەتایی و سـادەن، لـە داهـاتوودا سـەردەمێك دێتەپێشـەوە چـەند هۆکـارێکی تێدا دروسـتدەکرێت کـە نـەیانزانیوە، وەك ئەوەی خـوای گـەورە هەواڵـدەدات: ﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾النحـل/٨، واتـە: ئەسـپ و مـاین و هێسـتر و گوێدرێـژی (بـەدیهێنان تـا بـۆ) سـواری و گواسـتنەوە بـەکاری بهێـنن (سەرەڕای) دیمەنی قەشەنگیان، و شـتی تـریش دروسـتدەکات (کـە ئێسـتا ئێوە) نایزانن.

بە بیری هیچ یەکێك لە پێشینەکاندا نەهاتووە وتەی خـوایی ﴿وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەر و فڕۆکـە و ژێردەریایی و لـەو بابەتانە، بەڵام خوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا باسـی ئـەم گەشـەکردنەی کـردووە و دەفـەرموێت: ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ٤١ وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ ﴾یس/٤١-٤٢، واتە: بەڵگەو نیشـانەیەکی تـر (لـە هێـز و دەسـەڵاتمان) ئەوەیـە کـە ئێمـە نـەوەکانیانمان لـە کەشـتییەکەدا هەڵگرت، هەروەها کەشتی و هۆکاری تری لە وێنەی ئەوەمان بۆ سازاندون.

ئەم ئایەتە باس لە (فُلك) دەکات، ئـەویش ئـەو کەشتییەیە کـە خـەڵکی هەڵدەگرێت و دەگوێزێتەوە لە دەریاکاندا.

هەروەها بەرامبەر ئەم وتەیەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ﴾ هیچ کەسێك لەو سەردەمەدا زانیارییان دەربارەی ﴿مِّثْلِهِۦ﴾ هاوشێوەیی نەبووە هەرچەند ڕۆچوبێت لە بیرکردنەوەشیدا، هەرگیز بیری لەوە نەکردووەتەوە (شتێك) هەبێت بگاتە مانگ یان مەریخ و خێراییەکەی لەخێرایی دەنگ زیاتربێت. نەخێر، بەڵکو قورئانە ئاستی ژیری بەرامبەر (مخاطب) بەرزدەکاتەوە تاکو دەربارەی زەمەنی فەزایی لەگەڵی بدوێت، کە تیایدا هۆکارەکانی فڕین بەکاردەهێنرێت و لەچینێك بۆ چینێکی تر مرۆڤ بەرزدەکاتەوە، لە هەسارەیەك بۆ هەسارەیەکی تر.. ئەمەیە قورئانی پیرۆز ئامـاژەی پێدەکات کاتێك بە سوێند دەستپێدەکات و دەفـــەرموێت: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ﴾الإنشقاق/١٦-٢١، واتە: واتە سوێند بە ئاسۆ کە سوور هەڵدەگەڕێت و بەشەو و ئەوەی کۆی دەکاتەوە، و بەمانگی چواردە کاتێك کە تێر و تەواو و گەورە و درەخشانە ئێوە گۆڕانکاری و حاڵەتی زۆرتان بەسەر دێت، باشە ئەوە چیانە و بۆچی ئیمان ناهێنن؟ کاتێك کە قورئانیش بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە سوژدەنابەن و ملکەچ نابن؟

ئەم بابەتە لەبەر زۆر نامۆبوونی بە دەروونی مرۆڤەکان پێویستی بە سوێند هەبووە، تاکو دڵنیایی زیاتر لەسەری بدرێت، بەڵام کاتێك مرۆڤ گەیشتە ئەم پلە لەگەشەکردندا و دەبینێت قورئان بۆی باسکردووە، ئیتر بۆچی باوەڕناهێنێت.

سەرەڕای ئاشکرایی ئایەتەکە (وەك دەبینین)، هیچ یەکێك لە ڕاڤەکارە پێشینەکان باسیان لە بابەتی گەشتکردن بۆ فەزا نەکردووە وەك مانایەك لە ماناکانی ئەم ئایەتە... لەبەرئەوەی ڕاڤەکاری قورئان لەو سەردەمەدا وایداناوە ئەگەر ئەوە باس بکات ڕووبەڕووی ڕەخنە و دژایەتی دەبێتەوە، چونکە ئەگەر وابێت ئەوا قسەی لە شتێك کردووە لە دەرەوەی سوننەتەکانی سەردەم، بەڵام دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە دەبێت خوای گەورە شەوڕەوی بە محمد (ﷺ) کردووە لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا، پاشان میعراجی کردووە، ئەمەش لەو سەردەمەدا بووە. هەربۆیە بیستنی ئەو ڕووداوە لەلایەن بێباوەڕەکانەوە جێگای سەرسوڕمانێکی زۆر بووە تاکو مەسەلەکە گەیشتووەتە گاڵتەپێکردن، بەڵکو هەندێك لە باوەڕدارانیش نزیك بووە گومانیان بۆ دروستبێت.

هەر لەم میانەیەدا خوێندنەوەیەکی تر لە خوێندنەوە دروستەکانی قورئان هەیە بەمشێوەیە: ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾ بەوەی پیتی (ب)ی وشەی (لَتَرْكَبَنَّ) فەتحەی هەبێت، بەم شێوەیە خیتابەکە بۆ محمدە (ﷺ) پەیمانی دەداتێ بە گەشتکردن پێی چین بەچین، ئەمەش بەشێوەیەکی کرداری بە پێغەمبەر (ﷺ) کرا لە ڕووداوی شەوڕەوی و میعراجدا، بەڵام بەوەی پیتی (ب)ی وشەی(لَتَرْكَبُنَّ) زەممەی هەبێت... نازانیت... لەوانەیە گەشتکردن بۆمان (بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی) هێشتا لە سەرەتایدا بێت، و لەوانەیە چەندین هۆکاری تر هەبن کە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە بۆ هەڵگرتن و گواستنەوەی مرۆڤ بۆ دوورتر لەو شوێنانەی تا ئێستا توانیویەتی پێی بگات.. نازانییت..

قورئانی پیرۆز باس لە هۆکارێکی تری گواستنەوە دەکات (کە تا ئێستا نەزانراوە) شتەکان هەڵدەگرێت و دەگوێزێتەوە بەلایەنی کەمەوە بە خێرایی ڕووناکی ئەگـەر خێراتـر نـەبێت... ئـەوەش مرۆڤـە کـە تائێسـتا تـەنها توانیویەتی دەنگ و وێنەی بە خێرایی ڕووناکی بگوێزێتەوە لە ڕێگای مانگـە دەستکردەکان و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێتەوە، بـەڵام نەگەیشـتووەتە ئـەوەی تەنەکان بەشێوەی مـاددی ڕاسـتەقینەی خۆیانـەوە بـە خێرایـی ڕووناکی بگوێزێتەوە. گەیشتووە بـەوەی بیانگوێزێتـەوە، بـەڵام بـە خێرایـی کـەمێك زیاتر لە خێرایی دەنگ. هەتاکو ئێستا (بـەم ساتەشـەوە) مـرۆڤ خـەون بـەو ڕۆژەوە دەبینێت کە تیایدا بتوانێت تەنـەکان بـە ڕاسـتەقینە و بـە خێرایـی ڕووناکی بگوێزێتەوە.

ئەو ئایەتەی دەربارەی ئەم بابەتـە دەدوێـت ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە لەسەر زمانی سـولەیمان پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لێبێـت) دەگێڕێتـەوە، کاتێك داوای لە سەربازەکانی کرد (لە پەری ئەوانی تریش) پێشبڕکێ بکـەن لەسەر گواستنەوەی عەرشەکەی بەڵقیس لە یەمەنەوە بۆلای ئـەم لـە وڵاتـی شام، کە دووریەکەی بە هەزاران کیلۆمەتر مەزەنـدە دەکرێت (وەك پێشـتر باسمانکرد).

وەك تێبینی دەکەین ئەم قورئانە پڕیەتی لە پەند و بەرچاوڕوونی و وانە و زانسـت... ئایـا ئـەو ڕۆژە دێـت کـە موسـڵمانان گەنجینـە شـاراوەکانی دەربهێنن؟

ئایـا مـرۆڤ دەتوانێـت بکاتــە هۆکارێـك خێرایـی ڕوونـاکی هـەبێت بـۆ گواستنەوەی شتەکان بە جەستە ڕاستەقینەکانی خۆیانەوە؟ واز لە ڕۆژگـار دەهێنین وەڵام بداتەوە...

# كانزا و ناكانزاكان له قورئانی پیرۆزدا

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴾الرعد/١٧، واته: هەر ئـەو زاتەیـە لـە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، بـە ئەنـدازەی ئـەو دۆڵ و نشـێوە بـەهۆی ئـەو بارانە پڕدەبن (ئینجا لافاوێك دروست دەبێت)، ئەو لافـاوە كـەفوكوڵی بـەرز هەڵگرتووە، هەروەها لەسـەر ڕووی ئـەو كانزایانـەی ئـاگری تێبـەردەدەن و دەیتوێننەوە بە ئاگر بۆ دروستكردنی خشڵ (وەكو ئاڵتون و زیـو و پلاتـین) یـاخود بـۆ پێویسـتی تـر (وەكـو ئاسـن و مـس و قورقوشـم) كـەفوكوڵ دروستدەبێت وەك كـەفوكوڵی سـەر ئاوەكـە، ئـا بەوشـێوەیە خـوا نموونـە دەهێنێتەوە بۆ هەق و ناهەق، بۆ ڕاست و ناڕاست، جا ئـەوەی كەفوكوڵـە و بێسـوود و بێكەڵكـە دەڕوات و دەپوكێتـەوە، بـەڵام ئـەوەی سـوودبەخش و بەكەڵكە بۆ خەڵكی لەسەر زەویدا هـەر ئـەوە دەمێنێتـەوە، ئـا بەوشـێوەیە خوا نموونە جۆراوجۆرەكان دەهێنێتەوە.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی داوە بە پوختەكردنی كانزاكان لە ناكانزاكانەوە، ئەوەش بە تواندنەوەیان لە فڕنی تایبەتیدا كە پلەی گەرمی تیایـدا بـۆ ئـەو پلەیـــە بەرزدەكرێتـــەوە كـــە مـــاددەی خـــاو، ئـــەو ناكـــانزا و خڵتـــە و نەخواستراوانەی تێدایە، بتوێتەوە. ئەوەش بـە خڵتـە و پیسـی ناودەبرێـت.

ئەو خڵتـە و پیسیە دەکەونـە سـەرەوەی مـاددە تواوەکـە و کانزاکـەش لـە بەشی بنکەوەی کۆدەبێتەوە و دەکرێت جارجارە ڕابکێشرێت و لە شـێوە و قاڵبی ڕێکوپێـك و خواسـتراودا ڕەق بکرێنـەوە، تـاکو ئـەو شـێوە و دیمەنـە جیاوازانەیان لێ دروستبکرێت کە مرۆڤ لە کاروباری ژیانیدا بتوانێت بەکاریان بهێنێت.

قورئانی پیرۆز باسی لە بەکارهێنانی ئاگر کردووە لەلایـەن مرۆڤـەوە بـۆ تواندنـەوەی مـاددە ناکانزاکـان کـە لەپیشەسـازی خشـڵ و ئامێرەکـان و پێداویستییەکاندا بەکاردەهێنرێت، ئەوەش لە ئایەتەکەی پێشـوودا، خـوای مـــەزن دەفـــەرموێت: ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ﴾ واتـــە: لەسەر ئەو کانزایانـەی ئـاگری تـێ بـەردەدەن و دەیتوێننـەوە بـە ئـاگر بـۆ خشڵ یاخود بۆ پێویستی تر.

جێی باسە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بە چوار لە کانزاکـان (Metal) داوە، ئەوانیش: ئاسن، مس، زێڕش و زیو.

# داڕشتە کانزاییە پتەوەکان

خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾الکهــف/٩٦-٩٧، واتە: (ذوالقرنین وتی): پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەڵەکەی بکەن) هەتا ئەمبەر و ئەوبەری کێوەکەی پڕکرد، ئەوسا فەرمانیدا، تا بە (موشەدەمە) فووبکەن لەو ئاگرەی لەژێریدا کرابووەوە، هەتا کاتێک هەمووی کرد بە ئاگر، ئینجا (ذوالقرنین) وتی: ئادەی مسی تواوەم بۆ بهێنن تا بیکەم بەسەریدا (مس لەگەڵ ئاسندا تێکەڵ بکرێت پێکهاتەیەکی بەهێزی لێ دروستدەبێت)، ئەوسا ئیتر (یەئجوج ومەئجوج) نە توانیان سەربکەون، نە توانیان کوناودەری بکەن.

داڕشتەی پتەو ئاوێتەی ئاسنە لەگەڵ توخمێک یان زیاتردا، ئەو توخمە سەریارکراوانە سیفەتە ناوەکیەکانی دەگۆڕێت و زیاتر پتەوی دەکات و وایلێدەکات بەرگری ژەنگ و خۆرکە بگرێت، لەگەڵ چەندین سیفەتی بەسوودی خواستراوی تر.

قورئانی پیرۆز لە چیرۆکی (ذي القرنین)دا بەڕوونی ئاماژە بەو هونەرە دەکات، کاتێک خوای گەورە ڕێنمونی کردووە تاکو مسی تواوە (القطر) بۆ ئاسنەکە سەریار بکات و بەوەش زۆر پتەو و سەخت بووە.

لەم دواییانەدا ئەم ڕێگایە بەکارهێنرا لە بەهێزکردنی ئاسندا، بینرا سەرباركردنی بڕێك مس بۆی، بەرگری و پتەویی چەند هێند دەکات.

جێی باسە ئاسنی پوخت وەك هەندێك لە دارشتەکانی پتەو و بەهێز نییە، جۆرەکانی پۆڵا هەموویان دارشتەی ئاسنن لەگەڵ کەمێك کاربۆن یان مەنگەنیز...

## لەدەستدانی نەرمونیانی کانزاکان

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ۖ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴾طـه/٩٧، واتـە: (موسـا بـە سامیری) وت: دەبڕۆ تا ماویت لە ژیاندا (هەرکەسێك نزیکت کەوتەوە دەبێت) بڵێت: بەهیچ شێوەیەك بەریەککەوتن نییە (دیارە کە دەستی هەر کەسی بەرکەوتبێت تووشی ئازارێکی زۆر بووە)، دڵنیاشبە کاتێکی تریشت بۆ دیاریکراوە، کە هەرگیز ناتوانیت لێی دەرباز ببیت، سەرنجی خواکەشت بدە کە بەدەوریدا دەسوڕایتەوە و دەتپەرست، دەبێت بیسوتێنین و هەلاهەلای بکەین و بیخەینە ناو دەریاوە.

کانزاکان بە نەرمونیانی (مرونەت) جیا دەکرێنەوە (واتە توانابیان بۆ پێکهێنانیان لە پلەی گەرمی ئاساییدا یان بە کەمێك گەرمکردن)، بەڵام ئەگەر زۆر گەرم کرا و کتوپڕ سارد کرایەوە، ئەوا نەرمونیانییەکەی

لەدەستدەدات و هەر نوشتێنرایەوە یەکسەر دەشکێت و بەهۆی ساردکردنەوەکەوە لەتوپەت دەبێت و هەلاهەلا دەبێت.

لە چیرۆکی (سامیری)دا کە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ نەوەی ئیسرائیل لە زێڕ دروستکرد، موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) فەرمانیدا پەیکەرەکە زۆر گەرم بکرێت (بسوتێنرێت) پاشان بە ساردکردنەوەیەکی کتوپڕ لە ئاودا هەلاهەلا بکرێت، لەبەرئەمەیە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا﴾.

# نیشتمانی خامی توخمەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٖ مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهَاۚ وَمِنَ ٱلۡجِبَالِ جُدَدُۢ بِيضٞ وَحُمۡرٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٞ﴾فاطر/٢٧، واتە: ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە و جا ئێمە بەو بارانە جۆرەها بەروبوومی جیاوازمان دەرهێنا کە ڕەنگیان جیاوازە. هەروەها هەندێك لە کەژ و کێوەکانمان بە زنجیرە کێشاوە، هەیانە چین و هێڵ و نەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش ڕەنگیان جیاوازە، هەشیانە ڕەشێکی تاریك و تۆخە.

ئەم ئایەتە لەڕێی باسکردنی ڕەنگی شاخەکانەوە کە بەشێوەیەکی گشتی ڕەنگی بەردەکانی پێکهاتەی شاخەکان پەیوەندی سەرەکیان بە پێکهاتەی کانزایی و کیمیاییانەوە هەیە، ئاماژە بەشوێنگەی دەرهێنانی

ماددەی خـامی توخمـەکان دەدات، بـە ڕەنگـەکانیان باسیان دەکات، کـە ڕەشـی و سـووریی زیـاتر هـەن لـە گـرنگترین ئـەو توخمانـەی دەچـنە نێـو داهێنانەکانەوە وەك ئاسن و مس و مەنگەنیز.

سـپیش خـامی توخمـە گرنگـەکانی وەك ئەلـەمنیۆم و مەگنسـیۆم و خارسین دەگرێتەوە، ڕەنگەکانی تریش بەڵگەی توخمـەکانی تـرن، بـەوەی لەم سێ ڕەنگە (بەڕێـژەی جیـاوان) کۆمەڵێکـە تـر پێکدێن، لـە قورئانیشـدا ئامازە بەمە کراوە کە دەفەرموێت: ﴿مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهَا﴾.

قورئان ئامازەی بەو توخمانە داوە کە بوونیان لـە هـەموو داهێنانەکانـدا گرنگە لەڕووی جیاوازی نێوانیانەوە لە پێکهاتنیان لە هەر سـێ تەنۆلکەکـە، کە خوای گەورە سەرجەم توخمەکانی لێ پێکهێناون (ئـەلیکرتۆن و پرۆتـۆن و نیوترۆن). هەروەها ئامازەیداوە بەو توخمانە لـەڕووی چـوونی شـوێنگە و ڕەنگی خامەکانیانەوە لە شاخەکاندا. گـرنگترین ئـەو توخمانـەش لـە ڕووی چوونیەوە بـۆ نێـو داهێنانـەکان بریتییـە لـە ئاسـن، قورئـانی پـیرۆز باسـی لێکـردووە و لەبـەر بایـەخی گـەورەی ئاسـن لـە ژیـانی مرۆڤـدا یـەکێك لـە سورەتەکانی بەناوی (الحدید) ناوناوە.

# ئەوەی لەژێر خاکدا هەیە

سـەرەتا پێویسـتە ئـەوەمان لـەیادبێت، زانیـاریی دەربـارەی ئـەو گەوهەرانەی لەژێر خۆڵدا هەن پێش چوارده سەده هەرگیز یەکسان نییە بە زانیاریمان لەکاتی ئێستادا... زانیارییەکان دەربـارەی ئـەو ماددانـەی لـەژێر خاکدا هەن لە ڕابردوودا تەنها کورت بووەتەوە لە زانـین و ناسـینی هەنـدێك کانزای نزیك لە ڕووی زەوی و بە بڕێکی زۆر کـەمیش، بـەڵام ئـەوەی ئێسـتا دەیزانین زۆر زیاترە لەوەی پێشوو.

ئـەمڕۆ ئـەو مـادده و کانزایانـەی لـەژێر خۆڵـدا هـەن، دەبنـەهۆی بەرزکردنـەوە یـاخود نزمکردنـەوەی دەوڵـەتێك چ لـە ڕووی ئـابوری و کۆمەڵایەتییەوە بێت یان هەر ڕوویەکی تر. لەو مادده و کانزایانە وەك زێڕ و زیو و خەڵوزی بەردین و فۆسفات و ئەلەمنیۆم.

جێـی باسـە یـەکێك لـەو پێکهاتـە هـەرە گرنگانـەی لـە زەویـدا هەیـە (ئەگەرچـی کـانزا نییـە)، بریتییـە لـە نـەوت، لـەڕووی ئابورییـەوە نـەوت بایەخێکی گەورەی هەیە.

سەدان کانزا هەن دەچنە نێو پیشەسـازی هاوچـەرخەوە و هـەرگیز لـە پێشوودا نەزانراون (وەك یۆرانیۆم) کە هەمووشـیان لـەژێر خـاکی زەویـدان. هـەروەها ئـەو ئـاوەی زەوی لـەژێر توێکڵەکەیـدا بـە بڕێکـی زۆر کـۆی کردووەتەوە و بەشێوەیەکی سـەیر لـە خراپبـوون و بـۆنکردن پـارێزراوە... ئەمە هەرگیز لەکاتی دابەزینی قورئاندا نەزانراوە، بەڵام قورئانی پـیرۆز لـەو

سەردەمەدا ئاماژە بەو گەنجینانە دەدات کە نە محمد (ﷺ) و نە هیچ کەسێکی تر نەیاندەزانی. وەك دەفەرموێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ﴾طـه/٥-٦، واتە: خوای میهرەبان چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی بەو شێوەیەی کە لایەق بەخۆیەتی و هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا و هەرچی لە نێوانیاندا هەیەو هەرچی لەژێر خاکدایە خوا خاوەنیانە.

## دەرچوونی قورساییەکانی زەوی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ۝٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ﴾الإنشقاق/٣-٤، واتە: کاتێك دێت زەوی پان و بەرین دەبێتەوە، هەرچی لەناویدا هەیە فڕێی دەداتە سەر ڕووکاری و خۆی خاڵی دەکات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ۝١ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا﴾الزلزلة/١-٢، واتە: کاتێك زەوی دەهێنرێتە لەرزە و بومەلەرزە زۆر بەهێزەکەی بۆ پێشهات، هەرچی لە زەویدا هەبوو لە ماددە سەنگینەکانی ناوی دەرییەڕاند و هێنایە دەرەوە.

زانستی نوێ ئاشکرایکرد کە ناواخنی زەوی زۆر قورسە، چەندە قورستر بێت کێشکردنیشی زیاتر دەبێت. هەرچەند قوڵی ناواخنی زەوی پتر بێت هێندەش زەوی قورستر دەبێت تادەگەینە کرۆکی زەوی، لەوێدا ماددەیەکی

شـــلی قـــورس هەیـــە بـــەدەوری نـــاوکی زەویـــدا دەســـوڕێتەوە و لـــە سوڕانەوەکەشیەوە هێڵە موگناتیسییەکانی کێشکردن دروستدەبێت.

کەی قورساییەکانی زەوی دەردەچن؟

قورئـانی پـیرۆز هەواڵیـداوە لـەبارەی دەرکردنـی قورسـایی زەوییـەوە لەکاتێکدا کـە زەوی دەهێنرێتـە لـەرزە و زەمینلـەرزین ڕوودەدات، واتـە لـە ڕۆژی قیامەتدا، بەڵام هێشتا ئەو قورساییانە دەرنەچوون، ئاخۆ لەوکاتـەدا هێزی کێشکردن لەکوێ بێت؟

"د.سـتیفلز"ی ئـەمریکی لەگـەڵ ژمارەیـەك لـە موسـڵمانـاندا بەشـداری کۆنگرەیەکی کرد دەربارەی ڕاڤـەکردنی ئایـەتی: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾، ئـــەو وتویـــەتی: قورســـاییەکانی زەوی لەنێویدایە، لەپاشان ئەو قورساییانە دەردەچن و دێنـە دەرەوە. (دروست وەك ئەوەی ئایەتەکە ئاماژەی پێدەدات).

لەئایەتەکـەی تـردا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ۝٣ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ﴾ لـە وشـەی (تخلّـت- خـۆی خـاڵی دەکـات) ڕابمێنـە... کەواتە زەوی قورساییەکانی گرتووە... ئاخۆ ئەو کارە چۆنە؟

ئایا شتێك هەیە ئەو قورساییانەی نـاخی زەوی کـێش بکـات و بگرێـت.. بەڵێ... ئەویش هێزی کێشکردنی زەوییە. قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە و زانست تازەبەتازە دۆزیویەتیەوە. بەڵام ئایا هۆکاری ئەو کێشکردنە چییە؟ لەڕاســتیدا هۆکـاری ئـەو کێشـکردنە بـوونی قورسـاییەکانی زەوییـە لـە ناواخنیدا.

خوای گەورە ڕاستی فەرمووە: ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾الذاريات/٢٠.

# کانزای ئاسن

کاتێك زانایان دیراسەی بنەڕەتی ئاسنیان کرد، بۆیان دەرکەوت کە بەگشتی ئاسن لەسەرجەم کانزاکانی تری سەر زەوی جیاوازە، بینیان پێکهاتەی ئاسن لە ئەتۆمەکانی خۆڵی زەوی پێکنەهاتووە، بەڵکو لە ئەنجامی هاتنی نەیزەك و شوهبەوە پەیدابووە کە لە ئاسمانەوە ساڵانە هەزاران هەزاریان لێ دەکەوێتەخوارەوە بۆ سەرزەوی، کێشی هەندێکیان دەگاتە نزیکەی هەزاران تەن.

لەساڵی (١٩٠٢) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەیزەکێکیان دۆزییەوە کێشەکەی (٦٢ تەن) بوو و لە دارشتەی ئاسن و نیکل بوو، هەروەها نەیزەکێکی تر بەکێشی (١٢ تەن) لە پۆڵەندا دۆزرایەوە. هەموو زانایانی فەلەکیش لەو بڕوایەدان کە شوهب و نەیزەکە قەبارە جیاوازەکان هاوێژراوی گەردوونین کە لە ئەتۆمەکانی ئاسن و چەند کانزایەکی تر پێکهاتوون، بەڵام ئەتۆمەکانی ئاسن زۆرترین پێکهاتەکانیان پێکدێنن.

"ئارسەر بیرز" لەکتێبی (زەوی) دا نەیزەکی بۆ سێ بەشی گشتی پۆلێن کردووە:

١. نەیزەکە ئاسنیەکان: ئەمجۆرە زیاتر لە ٩٨٪ی پێکهاتەکەیان ئاسن و نیکلە.

٢. نەیزەکە ئاسنیە بەردییەکان: نیوەی پێکهاتەکەیان لە ئاسن و نیکلە و نیوەکەی تریان لە جۆری ئەو بەردەیە کە بە (ئۆلیفین) ناسراوە.

٣. نەیزەکە بەردییەکان: تەنها لە بەرد پێکدێن و بەردەکانیش چەند جۆرێکن.

زانایەکی ئاژانسی فەزایی ئەمریکی (ناسا) لە یەکێك لە کۆنگرەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئاندا دەڵێت: "لێکۆڵینەوەیەکی زۆرمان لەسەر کانزاکانی زەوی کرد، ئەو تاکە کانزایەی زانایانی سەرسام کردووە ئاسنە... تواناکانی ئاسن پێکهاتەیەکی جیاکراوەی هەیە... ئەلیکترۆن و نیوترۆنەکان لە گەردی ئاسندا بۆئەوەی یەکبگرن پێویستیان بە وزەیەکی زۆر گەورە هەیە دەگاتە چوار ئەوەندەی کۆی ئەو وزەیەی لە کۆمەڵەی خۆردا هەیە، لەبەرئەوە ناگونجێت ئاسن لە زەویدا دروستبووبێت، بەڵکو توخمێکی سەیر و نامۆیە و بۆ زەوی نێردراوە، تەنانەت ناکرێت ئاسن لەناو کۆمەڵەی خۆریشدا دروست ببێت، چونکە خۆر ئەستێرەیەکە وزە و گەرمیی پێویستی نییە بۆ یەکبوونی توخمی ئاسن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ الحدید/٢٥، واتە: ئاسنمان دابەزاندووە کە ماددەیەکی سەخت و ڕەقە و سوودبەخشیشە بۆ خەڵکی.

زانایانی کیمیا ئاشکرایان کرد ئاسن لە سەختترین و ڕەقترین کانزاکانە. زانست تائێستا کانزایەکی نەدۆزیوەتەوە لە سەختی و هێز و مرونەت و بەهێزی بەرگەگرتنی بۆ پەستان وێکچووی ئاسن بێت..

لەڕاستیدا تاکو سەدەی هەژدە مرۆڤ گرنگی و بایەخی ئاسنی نەزانیبوو لە پیشەسازیدا، واتە لەدوای دابەزینی قورئانی پیرۆزەوە بە دوانزە سەدە، لەسەدەی هەژدەوە بەشێوەیەکی کتوپڕ جیهان ڕوویکردە پیشەسازی ئاسن و ئاسانترین هۆکار و ڕێگای دۆزییەوە بۆ دەرهێنانی. ئێستا ئاسن وەك ماددەیەکی سەرەکی چووەتە نێو سەرجەم بوارەکانی پیشەسازییەوە، وەك گونجاوترین کانزا بەکاردەهێنرێت بۆ پیشەسازی دروستکردنی چەك و بنەڕەتێکە بۆ سەرجەم پیشەسازییە قورس و سووکەکانیش.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئاسن توخمێکی سەرەکیە لە پێکهاتەی زۆربەی بوونەوەرە زیندووەکاندا، لە پێکهاتەی ڕووەکەکاندا بەشێوەیەك کە ئاوێتەکانی ئاسن لە خۆڵەوە دەمژن، هەروەها لە هیمۆگلۆبینی خانەکان خوێنی مرۆڤ و ئاژەڵیشدا بەبڕی دیاریکراو هەن.

هەموو ئەمانە و لەلایەکی ترەوە تەبابوونێکی ژمارەیی قەشەنگیش لەو ئایەتەدا بەرچاودەکەوێت کە باس لە ئاسن دەکات. ژمارەی سورەتی (الحدید) لە قورئانی پیرۆزدا یەکسانە بە گەردیلەژمارەی توخمی ئاسن کە (٢٦)ـە، بارستەژمارەی ئاسنیش (٥٦)ـە کە دیسانەوە یەکسانە بە ژمارەی ئەو ئایەتەی سورەتی (الحدید) کە باس لە توخمی ئاسن دەکات.

پاکوبێگەردی بۆ ئەو خوایەی محمدی (ﷺ) فێری ئەم ڕاستیە زانستییانە کرد، خوای جیهانیان و بەدیهێنەری گەردوون.

# پێکهاتەی کیمیایی بەرد و مرۆڤ

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ۝٤٩ ۞قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ۝٥٠ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا﴾الإسراء/٤٩-٥١، واتە: ئەوانە بە سەرسامیەوە دەڵێن: باشە ئەگەر بووینە ئێسکی ڕزیو و پرتوکاو، ئەوە سەرلەنوێ زیندوو دەکرێینەوە؟! (ئەی محمد (ﷺ)) پێیان بڵێ: ببنە بەرد یان ئاسن... یان هەر شتێك و دروستکراوێك کە زۆر سەخت و گرنگ و گەورەیە لە بیر و هۆشتاندا، ئەوسا ئەوانە (بە سەرسامیەوە) دەڵێن: دەی باشە، کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ سەریان شۆڕ دەکەنەوە بۆ لات و سەر بادەدەن و دەڵێن: ئەوە کەی زیندوو دەکرێینەوە؟ کەی قیامەت بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ: دوور نییە و لەوانەیە بەم نزیکانە پێش بێت.

ئەمە تەحەددیی نکوڵیکارانی زیندووبوونەوە و گومانکارانە لەژیانی ڕۆژی دوایی، ئایەتەکە فەرمان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات بەو کەسانە بڵێت: گەر ئێوە بەرد یان ئاسنیش بوونایە، کە پتەوتر و ڕەقتریشە لە بەرد، یاخود هەر بەدیهێنراوێکی تر، خوای مەزن هەر لە توانایدا بوو بتانگێڕێتەوە وەك بەدیهێنانی یەکەمجار، ئەوەش جێگای سەسامی نییە.

مرۆڤ لە خۆڵ دروستكراوە و خۆڵیش هیچ نییە جگە لە پەرتبووی بەرد و تاوێری پێكهاتەی توێكڵی زەوی، لەبەرئەوە خوای مەزن كە دەفەرموێت: ﴿كُونُواْ حِجَارَةً﴾ سەرجەم ڕەگەزە پێكهێنەرەكانی خۆڵ (بە ئاسنیشەوە) لەخۆدەگرێت. زانستی نوێ سەلماندوویەتی:

(جەستەی مرۆڤ لە هەمان ڕەگەزە پێكهێنەرەكان خاك پێكهاتووە) دروست هەروەك ئەوەی زانای جیۆلۆجی "فینوگرداف" لە ساڵی (١٩٣٣)دا دانی پێدانا كە پێكهاتەی كیمیایی هەموو زیندەوەران هاوشێوەن، گەر توخمەكانی وەك كاربۆن و هایدرۆجین و ئۆكسجین و نایترۆجین و فۆسفۆر و كبریتت لەبەرچاوگرت".

# شاخ لە زانستی زەویناسیدا

لە زانستی زەویناسیدا شاخ بەو بارستەیە لە زەوی پێناسە دەکرێت کـە بەشێوەیەکی دیار بەرزترە لە وشـکانیەکانی دەوروبـەری و لێـواری کـووڕی هەیە. ئاسـایی شـاخ بـەو بەرزاییانـە دەوترێـت کـە زیـاتر لـە (٦٠٠مـەتر) لەسەروو ئاستی ڕووی دەریاوە بـەرزن، هەرچـەند ئـەم بەرزییـە دیاریکراو نییە، چونکە ڕێژەییە و بەنـدە لەسـەر بـەرز و نزمـی دەوروبەرەکـەی، هـەر بۆیە لە ناوچەی دەشتاییدا دەگونجێت نیوەی ئەم بەرزاییـە بـەس بێـت بـۆ وەسفکردنی شاخ.

ئاشکرایە شاخەکان بەشێوەی پێکەوە بەستراو وەك زنجیرە شـاخ هـەن یان بە تەنها و بەشێوەی بەرزاییەکی تـاك، دابەشبوونیشـیان لەسـەر زەوی لەسەر پشتێنەکانی درێژی تەریب بە لێواری کیشوەرەکان دەبێت.

# ئاماژە جیاوازەكانی قورئانی پیرۆز بە شاخ (الجبل)

لـە قورئـانی پـیرۆزدا وشـەی (الجبـل) بەشـێوەی تـاك و كـۆ (٣٩)جـار هاتووە، لەوانە (٦) جار بەشێوەی تاك و (٣٣) جار بەشێوەی كۆ. هەروەها لە (٩) ئایەتی تردا ئاماژە بە شاخ كراوە بە وشەی (الرواسي).

دەتوانرێت سەرجەم ئاماژەكانی قورئانی پیرۆز بە شاخ كە (٤٨) جـارن، بۆ ئەم كۆمەڵانە پۆلێن بكەین:

١. دوو ئایـــەت ئامـــاژە دەدەن بـــە شـــێوەیەكی بـــەرزی زەوی، كـــە بەرزییەكی تێبینی كراوی هەبێت (البقرة:٢٦٠، هود:٤٣).

٢. چەند ئایەتێك بە شێوەیەكی ڕەمزیی ئاماژە بە گەورەیی بارستە چیاییەكان دەدەن یاخود نیشانەن بۆ بەرزیی یان سروشتە زۆر ڕەقەكـەیان (الرعد:٣١، إبراهيم:٤٦، الإسراء:٣٧، مريم:٨، الأحزاب:٧٢، الحشر:٢١).

٣. لـە دوو ئایەتـدا شـاخ لەپێگـەی لێكچـواندندا هـاتووە (هـود:٤٢، النور:٤٣).

٤. چـەند ئایـەتێك ئامـاژە بـە شـاخی بـەهاداری مێـژوویی دەدەن، وەك شاخی (ثمود) (الأعراف:٧٤، الحجر:٨٢، الشعراء:١٤٩).

٥. چەند ئایەتێك ئاماژە دەدەن بە شاخ كـە گـەواهی مـوعجیزەن، وەك چـیای پێغەمبـەران ئیـبراهیم و موسـا (سـەلامی خوایـان لەسـەربێ) (البقرة:٢٦٠، الأعراف:١٤٣،١٧١).

٦. چەند ئایەتێك ئاماژە دەدەن بە بەكارهێنانی شاخ لەلایەن هەریەك لە مرۆڤ و ئاژەڵ وەك پەناگە (النحل:٨١،٦٨) هەروەها وەك سەرچاوەی ئاوی ڕۆیشتوو (الرعد:٣، النحل:١٥، النمل:٦١، المرسلات:٢٧).

٧. كۆمەڵە ئایەتێك ئاماژە بە شاخ دەدەن لە ڕیزبەندی ئەو بەدیهێنراوانەی كە تەسبیحاتی خوای گەورە دەكەن (الأنبیاء:٧٩، الحج:١٨، ص:١٨).

٨. چەند ئایەتێك وەسفی سەرەنجامی شاخەكان دەكەن لە ڕۆژی قیامەتدا (الكهف:٤٧، طه:١٠٥، الطور:١٠، الواقعة:٥، الحاقة:١٤، المعارج:٩، المزمل:١٤، المرسلات:١٠، النبأ:٢٠، التكویر:٣، القارعة:٥).

٩. هەروەها كۆمەڵە ئایەتێكی تر لە قورئاندا لە دەوری چەمكی زانستی شاخەكان دەسوڕێنەوە، لەوانە ئایەتێك كە وەسفی شاخەكان دەكات بە مێخ (أوتاد)، وەك ئاماژە بەوەی بەشێكی زۆری لەژێر زەویدا نێژراوە و كەمێكی لەسەر ڕووی زەوییەوە دیارە و ئەركەكەشی جێگیركردن و چەسپاندنە (النبأ)... چەند ئایەتێكی تر ئاماژە بە ڕۆڵی شاخەكان دەدەن لە جێگیركردنی زەویدا (الرعد:٣، الحجر:١٩، النحل:١٥، الأنبیاء:٣١، النمل:٦١، لقمان:١٠، فصلت:١٠، ق:٧، المرسلات:٢٧، النازعات:٣٢، الغاشیة:١٩). هەروەها ئایەتێكی تر لەم كۆمەڵە ئایەتە ئاماژە بە بوونی هێڵ و نەخشە (جُدَد)ی ڕەنگ جیاوازی شاخەكان دەدات (فاطر:٢٧)، یان ئەوەی كە شاخەكان شوێنكەوتەی جوڵەی زەوین لە سوڕانەوەی بەدەوری تەوەرەكەی خۆیدا (النمل:٨٨).

پشت بەخوا لەم باسەماندا بەكورتی لەسەر دواهەمین كۆمەڵە ئایەت دەدوێین كە باس لە چەمكی زانستی شاخەكان دەكەن، لە چوار خاڵدا:

یەكەم: خاسیەتی مێخێتی شاخەكان.

دووەم: ڕۆڵی شاخەکان لە جێگیرکردن و چەسپاندنی زەویدا.

سێیەم: بوونی هێڵ و نەخشەی ڕەنگ جیاواز (جُدَد) لەسەر شاخەکان.

چـوارەم: جوڵـەی شـاخەکان هاوکـاتی جوڵـەی زەوییـە بـەدەوری تەوەرەکەیدا.

## یەکەم:

## خاسیەتی مێخێتی شاخەکان

تەفسـیری هـەردوو ئایـەتی: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ۝٦ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾النبأ/٦-٧، لای ڕاڤەکارە پێشینەکان:

"إبن كثير" لـە ڕاڤـەی ئایـەتی ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا﴾ دەڵێت: "زەوی وەك لانکەیەکـە بـۆ بـەدیهێنراوەکان ، ملکەچـیانە، جـێگیر و چەسـپاوە، هـەروەها ﴿وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ واتـە: مێخـی بـۆ دانـاوە، بەهۆیـەوە لەنگـەری گرتووە و چەسپاوە و جێگیر بووە و ئارامی بۆ هـەموو ئـەوەی لەسـەریەتی فەراهەم هێناوە.

خاوەنانی (تفسیر الجلالین) وتەیەکی لێکچوو دێنن و دەڵێن: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا﴾ واتـە: ڕاخراوێـك وەك لانکـە گونجـاوە بـۆ ژیـان لەسـەری، ﴿وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ واتە: زەوی پێ جێگیر بـووە، وەك چۆن بـەهۆی مێخـەوە دەوار دەچەسپێت، تاکو پەرش و بلاوتان نـەکات، شێوازی پرسـیاریش بـۆ دان پێدانانە.

هاوشێوەی ئەم مانایەش لە تەفسیرە جیاوازەکاندا هاتووە، وەك لە (صفوة البيان لمعاني القرآن) و (صفوة التفاسير) و (المنتخب في تفسير القرآن الكريم)...هتد. هەروەها دەربارەی ﴿وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ "إبن الجوزي" دەڵێت: "واتە مێخە بۆ زەوی تاکو نەکشێت و فراوان نەبێت". "الزمخشري" دەڵێت: "واتە زەویمان بە شاخەکان جێگیر و لەنگەر پێگرتووە، هەروەك چۆن ماڵ بە مێخ جێگیر دەبێت".

پوختەی ماناکان دەبێتە ئەوەی کە پەروەردگار زەوی وەك لانکەیەك لێکردووە، بەهۆی شاخەکانیشەوە کە ڕەگی درێژبووەوەیان هەیە بەنێو زەویدا، زەوی جێگیر و چەسپاو کردووە تاکو لە پەرتبوون و بڵاوبوونەوەی بەشەکانی پارێزراو بێت و باش و گونجاو بێت بۆ ئاوەدانی و بۆ ژیانی مرۆڤ و بەدیهێنراوەکانی تری سەر زەوی.

## مێژووی دروستبوونی بیرۆکەی بوونی ڕەگی شاخەکان

سەرەتای بیرکردنەوە سەبارەت بە بوونی ڕەگی شاخەکان لە ساڵی (١٨٨٥)دا بوو، کاتێك تیمی ڕووپێوی بەریتانی هەستان بە ڕووپێوکردنی شاخی هیمالایا، لە کارەکەیاندا جیاوازییەکی بەرچاویان بەدیکرد لە خوێندنەوەکانی هێزی کێشکردندا. یەکێك لە زاناکان لێکۆڵینەوەی لەم حاڵەتە کرد تاکو لەکۆتاییدا گرفتێکی پێشهات و خستیە بەردەم زانای بەریتانی "جەی بی ئیری- G.B.AIRY" ئەم زانایەش پاش بەردەوامبوونی لە لێکۆڵینەوەکەیدا بۆماوەی دوو مانگ گەیشتە ڕایەکی نوێ و وتی: "من لەم خوێندنەوانەی ئامێرەکەوە بۆ دەرکەوتووە کە لەژێر هەر شاخێك لەم شاخانەدا ڕەگێك هەیە لە چینی ژێرەوەی شاخەکەدا

ڕۆچووە"، بەڵام زانایەکی تر بەناوی "براك" کە هاوچەرخی "ئیری" بوو ڕاڤەی ئەو حاڵەتەی بەوە کرد کە لە ژێر شاخەکاندا ڕوودانێکی پەستان هەیە کە بارستە قورسەکەی بۆ تەنیشتەکان پاڵ پێوەناوە". دوای ئەمان زانایەکی تر بەناوی "ماینس" هات لەساڵی (١٩٣٠)دا، ئەو وتی: "شاخ پەستان دروستدەکات و ئەو چینەی کە ڕاستەوخۆ لەژێریدایە دەچەمێتەوە، بۆیە شاخ هیچ درێژبوونەوەیەکی نییە وەك "ئیری" باسی لێوە دەکات".

تا ئەوکاتە سێ تێڕوانینی جیاواز لەم بارەیەوە هەبوون: یەکەمیان ڕای "ئیری" کە دەڵێت: شاخ درێژبوونەوەی هەیە بەشێوەی ڕەگ و چینەکەی ژێر خۆی دەبڕێت، دووەمیان ڕای "براك" کە دەڵێت: لەژێر شاخەکاندا لادانێك ڕوویداوە و ماددە قورسەکەش بۆ لاکان جوڵاون، سێیەمیش ڕای "مانس" بوو کە شاخەکە پەستان لەسەر بەشی ژێرەوەی دروستدەکات و بەوەش ئەو چینە بەتەواوی دەچەمێتەوە و شاخەکە هیچ درێژبوونەوەیەکی نییە. ئەم ڕا جیاوازانە خوێندنەوەی جیاواز و تێبینی زۆریان لەسەربوو.

لە گۆڤاری زانستی ئەمریکی یۆلیۆی (١٩٨٦)دا نووسەرێکی زانستی تێیدا وتویەتی: "لێکۆڵینەوە زەمینلەرزەییەکان کە بەدرێژایی دەیان ساڵی ڕابردوو ئەنجام دراون پاڵپشتی بۆچوونەکەی "ئیری" دەکەن و ڕاستیەکەی دەسەلمێنن".

لەکۆتاییدا بەهۆی دۆزینەوەی ئامێرەکانی پێوانەکردنی زەمینلەرزە و وەرگری شەپۆلە زەمینلەرزەییەکانەوە سەلمێنرا هەموو شاخێك ڕەگێکی درێژبووەوەی هەیە تا ئەو چینەی لەژێریدایە دەبڕێت. لەساڵی (١٩٦٠)یشدا گرنگی و کاری ئەم ڕەگە زانرا کە بۆ جێگیرکردن و چەسپاندنی توێکڵی زەوییە.

## چەمكی زانستی خاسیەتی میّخیّتی شاخەكان

وەك ئاشـكرایە ڕووی زەوی بەتـەواوی تـەخت نییـە، ئەمـەش بـەهۆی جیاوازی تیكتۆنی (واتە كۆی چالاكی پلیّتـەكانی زەوی كە بـەریك دەكـەون یـان دووردەكەونـــەوە یـــان بەســـەر یەكـــدا دەخلیســـكیّن) و شـــویّنی جیۆلۆجیەوە.

لە زنجیرە چیاكاندا لوتكەی بلّند هەیـە و بـەرزایی ئـەم لوتكانـەش كـەم دەكات بۆ گرد و بان و پاشان دەشتاییەكان و ناوچـە نزماییـەكانی زەوی و دەریاكان. بەرزترین لوتكە لەسەر ڕووی زەوی لوتكەی شاخی (ئیڤریّست)ـە لـەزنجیرە شـاخەكانی هیمالایـا كـە بەرزییەكـەی بەنزیكـەیی دەگاتـە (٨٨٤٠مـەتر) لەسـەروو ئاسـتی ڕووی دەریـاوە. لەلایـەكی تـرەوە نـزمترین ناوچـە لەسـەر ڕووی زەوی بنـی دەریـای مـردووە كـە دەگاتـە دەوروبـەری (٣٩٥مەتر) لەژیّر ئاستی ڕووی دەریاوە. تیّكڕای ئاسـتی ڕووی وشـكانی بـە (٨٤٠مـەتر) لەسـەروو ئاسـتی ڕووی دەریـاوە دادەنریّـت و ئاسـتی قـولّترین نزمـایی زەریاكـان دەگاتـە (١٠٨٠٠مـەتر)، لەكاتیّكـدا كـە تیّكـڕای قـولّیی زەریاكان دەگاتە (٤ كیلۆمەتر) لەژیّر ئاستی ڕووی دەریاوە.

جیاوازی نیّوان بەرزترین لوتكەی وشكانی و نزمترین خالّ لە بنكی دەریا و زەریاكاندا دەگاتە (١٩٦٤٠مەتر). ئەگەر ئەم جیاوازییەش بەراورد بكریّـت بـە نیـــوەتیرەی زەوی (٦٣٧١كیلۆمـــەتر) ئـــەوا ڕیّژەیـــەكی دیـــاریكراو دەردەچـیّت، ئـەم ڕیّژەیـە ڕۆلّیّكـی گـرنگ دەبینیّـت لـە یـاوەریكردنی فاكتەرەكانی داماڵین و داڕمانە جیاوازەكان لەسەر وردكردن و بوونـە خـۆلّی پیّكهاتەی بەرزاییەكانی زەوی و فڕیّدانی ئەو پارچە وردبوانەش كـە لیّـوەی دروسـتبوون بـۆ ناوچـە و شـویّنە نزمـەكان، ئەمـەش بـە تیّپـەڕبوونی كـات

كاردەكاتە سەر ڕێكخستن و تەختكردنی ڕووی زەوی و دروستبوونی خۆڵ و چڕبوونەوەی كانزا خامەكان و لەكۆتاییشدا ئامادەكردنی زەوی تاكو بۆ ئاوەدانی چاك و گونجاو بێت.

ئەو بەڵگە زانستییانەی لەماوەی هەردوو سەدەی نۆزدە و بیستدا لای زاناكان كەڵەكە بوو، ئاماژە بەوە دەدەن بەرگی بەردینی زەوی لە حاڵەتی هاوسەنگی و ڕێكوپێكیدایە و هەركات ئەم هاوسەنگییە لە هەر خاڵێكی سەر ڕووی زەوی تووشی جۆرێك لە تێكچوون هات، ئەوا ڕاستەوخۆ ڕێكدەبنەوە.

توێكڵی زەوی لەكاتی باركردنی قورسایی زیادەدا بۆ خوارەوە نزم دەبێتەوە (ڕۆدەچێت) لەسەر شێوەی نزمییە تایبەتییەكانی زەوی، لەكاتی لابردنی ئەو بارە زیادانەشدا بۆ سەرەوە لەسەر شێوەی بەرزایی سەر زەوی بەرزدەبێتەوە ·هێزێكی پاڵنەر لەژێرەوە پاڵ بە شاخەكانەوە دەنێت و بەهەمان ڕێژە بەرزیان دەكاتەوە)، هەر یەك لەم حاڵەتانەش بۆ پاراستنی هاوسەنگی زەوییە. لەنموونەی ئەمە ئەو حاڵەتانەیە كە ڕوودەدات لەئەنجامی كۆبوونەوەی سەهۆڵ بە ئەستوورییەكی زۆر لەسەر وشكایی و پاشان لابردنی، یان لەكاتی گلدانەوەی ئاو بەملیۆنان مەترسێجا لەبەردەم بەربەستەكاندا و پاشان بەكارهێنانی، یان كەڵەكەبوونی هەزاران تەن نیشتوو لەبەردەم بەربەستەكاندا و پاشان لابردنیان، یاخود كەوتنەخوارەوەی ماددە گڕكانیەكان لەدەوری ژمارەیەك لە دەرچە گڕكانیەكان و پاشان ڕامالینیان.

لە سەردەمی نوێدا توانەوەی سەهۆڵە كەڵەكەبووەكان دەستی پێكرد كە لەسەر هەندێك ناوچەی وشكانی نیوەگۆی باكوور لەماوەی دوو ملیۆن ساڵەوە كۆبووەتەوە (لەماوەی یەكێك لە گەورەترین چاخە سەهۆڵیەكاندا كە زەوی پێیدا تێپەڕیوە). لەئەنجامی ئەم توانەوەیەشەوە بەرزبوونەوەی

ئاسـتی ڕووی زەوی لـەو ناوچـانەدا بـەهۆی توانـەوەی سـەهۆڵەکەوە بـە پلەبەندی دەستی پێکردووە، ئەمەش بۆ هاتنـەدی هاوسـەنگی لـە پەسـتان کەوتنە سەر ڕووی زەوی، کە یەکێکە لە سوننەتەکانی خوای گەورە تیایدا.

لەبــەردەم زۆرێــك لــەو بەربەســتانەی لەســـەر ڕێــڕەوی ڕووبارەکــان دروستکراون ملیۆنان مەترسێجا ئاو و هەزاران تەن لـە مـاددە نیشـتووەکان لەبەردەم ئـەم بەربەسـتانەدا کۆبوونەتـەوە کـە بوونەتـە هـۆی دابەزانـدن و نزمکردنەوەیەکی گشتی لە ئاستەکانی ناوچەکەدا و زیـادبوونێکی بەرچـاوی چالاکی زەمینلەرزەیی، ئەمەش بەوە لێکدەدرێتەوە کـە چینە تەختـەکانی بـەرگی بـەردینی پێکهێنـەری کیشـوەرەکان کـە ئەسـتووری هەریەکـەیان لەنێوان (١٠٠–١٥٠)کیلۆمەتردایـە و پێکهاتەکـەیان بەشـێوەیەکی سـەرەکی بـەردی چڕیی کەمـە، لەکاتێکـدا کـە پێکهاتـەی چینە تەختـەکانی بـەرگی بەردینی پێکهاتەی بنی دەریا و زەریاکان بەڕێژەیی لـە بـەردی چڕیی زۆرە (بۆیـە ئەسـتووریی هـەر یـەکێك لەوانـە لـە تـەنها حـەوت کیلۆمـەتر تێپـەڕ ناکات).

هەر یەکە لـە چینە تەختـەکانی بـەرگی بـەردینی کیشـوەر و زەریاکـان دەکەونە سەر پشتێنە یاخود هەرێمی لاوازی زەوی (نطاق الضعف الأرضي) کە پشتێنەیەکی جیڕ و نیمچە تواوە و چڕی و لینجی بەرزە، بـە پەسشـتان کاریگەر دەبێت و وەك وەلامێك بۆ پەستانەکەی سەری جوڵەیەك دەکات.

هــەروەها ئــەو بەشــەی تــوێکڵی زەوی کــە بارســتەی کیشــوەرەکانی پێکهێنــاوە ئەســتورییەکەی بەنزیکــەیی لــەنێوان (٣٠–٤٠) کیلۆمەتردایــە، پێکهاتەکەشی زیاتر بەردی گرانیتیە کە بـەزۆریی بە چەند چینێکی یەك لەدوایەکی ئەستوریی جیاواز لە بەردە نیشتەنیەکان دادەپۆشرێت (تێکڕای چـڕیی بـەردی گرانیتـی دەکاتـە ٢,٧گـرام بـۆ هـەر سـانتیمەتر سـێجایەك)

لەكاتێكدا كە ئەستوریی توێكڵی زەوی پێكهاتەی بنكی دەریا و زەریاكـان لەنێوان (٥-٨) كیلۆمەتردایە و بەزۆریی لە بـەردی بـازیلتی پێكهـاتووە كـە هەندێجار لەگەڵ بەردە نیشتەنیەكان دەگۆڕێت یاخود بە چەند چینێك لـە بەردە نیشتەنیەكان دادەپۆشرێن (تێكڕای بەردی بازیلتی دەگاتـە ٢,٩گـرام بـۆ هـەر سـانتیمەتر سێجایەك). لەبـەر ئەوەیـە بارسـتەی كیشـوەرەكان سەردەكەونە سەر بنكی دەریا و زەریاكان.

دەتوانرێت بەهەمان بۆچوون شرۆڤەی ئەو جیاوازیە بكرێت كە لە ئاستی ڕووی زەوی ناوچە جیاوازەكاندا هەیە، ئەویش لەسـەر بنـەمای دیـاریكردنی چڕیی بەردی پێكهاتەی هەر شێوەیەك لە شـێوەكانی ئـەو بـەرز و نزمیانـە، بۆیە بەرزاییەكانی سەر ڕووی وشكانی دەبێـت زۆرینـەی پێكهاتـەكانیان لـە بەردی چڕیی كەمتر بن وەك لە بەردی پێكهاتـەكانی دەوروبـەریان. لـەوەش گرنگتر، دەبێت بەردە سووكە كەم چڕەكان درێژبوونـەوەیان هـەبێت بـەنێو بەردە چڕیی زۆرەكانی دەوروبەریان.

لێرەدا بۆچوونەكە بەدەستدێت كـە: دەبێـت شـاخەكان ڕەگـی قوولّیـان هـەبێت بەشـێوەیەك كـە بەتـەواوی بـەرگی بـەردینی زەوی ببڕێـت تـاكو سـەربكەوێتە سـەر پشـتێنەی لاوازی زەوی، كـە تیایـدا یاسـاكانی سـەرئاوكەوتن (یاسـای ئەرخەمیـدس) تەحـەكومی دەكـەن وەك چـۆن تەحەكومی شاخە سەهۆڵییە سەركەوتووەكانی ئاوی زەریاكان دەكات.

لەلایەكی ترەوە پێوانەكانی تاودانی زەویش پاڵپشـتی ئـەم ڕاستییەن، بەوەی لە ناوچە شاخاوییەكاندا كـەمتر لـە نرخـی تیـۆری تۆمـاركراوە و لـە ناوچە نزمەكانی زەوی و بنی دەریا و زەریاكاندا زیاتر لـە نرخـی پێشـبینی كراو بووە.

به لێکۆڵینەوەی ورد لە شاخەکان و لەم ساڵانەی دواییدا، سەلمێنراوە کە هەر بەرزاییەکی زەوی لەسەروو ئاستی ڕووی دەریا، درێژکراوەی هەیە بەنێو بەرگی بەردینی زەویدا کە درێژییەکەی لەنێوان (١٠-١٥) ئەوەندەی بەرزییەکەیەتی لەسەروو ڕووی زەوییەوە. هەرچەندیش بەرزییەکەی لەسەروو ئاستی ڕووی دەریاوە زیاتربێت، درێژی بەشە ڕۆچووەکەی بەنێو زەویدا چەندهێند دەبێت، بەمجۆرە لوتکەیەکی وەك (ئیڤرێست) کە بەرزیەکەی لەسەروو ئاستی ڕووی دەریاوە ناگاتە (٩کیلۆمەتر)، بەڵام درێژکراوەی ئەم لوتکەیە (واتە ڕەگەکەی) بەنێو زەویدا زیاترە لە (١٣٠کیلۆمەتر)، بەتەواوی بەرگی بەردینی زەوی دەبڕێت تاکو سەربکەوێتە سەر پشتێنەی لاوازی زەوی.

پاکوبێگەردی بۆ ئەو خوایەی وەسفی شاخەکانی بە مێخ (أوتاد) کردووە، کە بەڕاستی تاکە دەستەواژەیە هەریەك لە شێوەی دەرەوەی شاخ و درێژبوونەوەکەی بەنێو زەویدا و فرمانەکەشی لەخۆبگرێت، چونکە مێخ زۆرینەی دەچێتە زەوییەوە و کەمێکی لەسەر ڕووی زەوییەوە دەردەکەوێت و فرمانەکەشی جێگیرکردن و چەسپاندنە.

دووەم:

## چەسپاندن و لەنگەرپێگرتنی زەوی
## یان شاخەکان لەسەر زەوی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾النازعات/٣٠، وشەی (دحی) لەم ئایەتەدا دوو مانای سەرەكی دەدات: (المدّ) و (الإلقاء) واتە: فراوانبوون و كشان لەگەڵ هەڵدان و فرێدان.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾ق/٧، واتە: زەویمان ڕاخستووە و بڵاومان كردووەتەوە و كەژ و كێومان لەسەری دامەزراندووە و لە هەموو جۆرە ڕووەكێكی جوان و بۆنخۆش و تامدارمان تێدا ڕواندووە.

لەم ئایەتەشدا وەسفی (مدّ)ی زەوی كراوە و پەیوەست كراوە بە ئاو و شاخەوە، وشەی (دحی) مانای (إلقاء) و (مدّ) دەدات، مانای ئەو كردارە دەدات كە كیشوەرەكان و زەوی پێ دروستبووە: كرداری دەرپەڕان و دەرچوون لە وێنەی بوركان هەڵدان و هاویشتنی بۆ سەرەوە لە ناوەوەی زەوییەوە، و كرداری كشانی ئاسۆیی زەویش كە كیشوەرەكانی پێكهێناوە، شاخەكان لەسەرەتادا زۆربەیان بوركانی بوون و بەكردای (إلقاء) واتە: فرێدانی گەرمییە بوركانییەكان لە ناواخنی زەوییەوە بۆ سەرەوە و كەڵەكەبوونیان دروستبوون.

لە فەرموودەیەكدا كە زیاتر ڕوونكەرەوەی قورئانی پیرۆزە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿لَمَّا خلقَ اللهُ الأرضَ جعَلَتْ تَميد، فَخلقَ الجبال، فعاد بها عليها فاستقرّتْ﴾(جزء من حديث رواه الترمذي وأحمد وأبويعلى وهو

حديث حسن)، لە مەفهومی فەرموودەکەدا ئاشکرایە کە (فَعاد بِها عليها): فرێـدان و هاویشـتنەکە لـە زەوییـەوە بـووە و پاشـان بـەهۆی هێـزی کێشکردنەوە بەرەو زەوی گەڕاوەتەوە.

واتە: ماددەی پێکهاتەی شاخ لە سەرەتادا لە ناواخنی زەوییەوە بەرەو سەرەوە دەرچووە و پاشان بەهۆی هێزی کێشـکردنەوە گەڕاوەتـەوە سـەر زەوی و بە کەڵەکەبوونی، شاخ پێکهاتووە.

بـەهۆی بـەردەوامبوونی کردارەکەشـەوە قورسـایی لەسـەر ڕووی زەوی دروستبووە و ئەمەش پەستانی لەسەر تواوە بەردینیەکان دروسـتکردووە و بوار بۆ درێژبوونـەوەی بەشـی ژێـرەوەی دروسـتبووە تـاکو بـەو تواوەیـەدا ڕۆبچـێت، ئەمـەش بووەتـە هـۆی جێگیرکردنـی تـوێکڵی زەوی لەلایـەك و چەسپینی شاخەکە خۆیشی لەلایەکی ترەوە، ئەم ڕاسـتییەش بـەڕوونی لـە ئایەتی ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾دا دەردەکەوێت.

ڕاڤـەکارە پێشـینەکان دەربـارەی ئـەم ئایەتـە دەڵـێن: ڕانـاوی (هـا) لـە وشەی (أرسـاها)دا دەگەڕێتـەوە بـۆ (الجبـال)، بـەم پێیـە ئایەتەکـە مانـای چەسپاندنی شاخەکان دەگرێتەوە لە زەویدا، لەلایەکی ترەوە ئایەتەکـە لـە ناوەڕۆکیدا مانای جێگیربوون و چەسپینی زەویش لـەخۆدەگرێت بەتایبـەت بەو بەڵگەیەی ڕاناوە نادیارەکە لە دوو ئایەتەکەی پێشووی ئەم ئایەتەدا بۆ زەوی دەگەڕێتـــەوە: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ٣٠ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ٣١ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾النازعـات/٣٠-٣٢. لـەم ڕەهەنـدەی دواییشـەوە مانـای ئایەتەکە دەبێتە: جێگیرکردن و لەنگەرگرتنی زەوی بەهۆی شاخەکانەوە.

کەواتە دەکرێت دوو خوێندنەوەی مانا بۆ ئایەتە پیرۆزەکە بکرێت:

١. جێگیرکردن و چەسپینی شاخەکان لەسەر ڕووی زەوی.

٢. جێگیربوون و لەنگەرگرتنی زەوی بەهۆی شاخەكانەوە.

هەردوو ماناكەش بەپێی دەرهاویشتەكانی زانستی زەویناسی نوێ ڕاست و دروستن. شاخەكان لە بەرگی بەردینی زەویدا چەسپاون و زەویش جێگیر و چەسپاو دەكەن.

یەكەم/ ﴿وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا﴾ بەمانای:

**جێگیركردن و لەنگەرگرتنی شاخەكان لەسەر ڕووی زەوی**

بەڵگەی تەواو بەدەستەوەن كە بەرگی بەردینی زەوی، سەرەڕای بوونی بەرزی و نزمی ئاشكرا لەسەر ڕووەكەی لەحاڵەتی هاوسەنگی تەواودایە، ئەمەش بەو مانایە كە بڕی بارستەی مادده بەدرێژایی هەموو نیوەتیرەكانی زەوی (درێژبووەوە لە سەنتەری زەوییەوە تا خاڵە جیاجیاكانی سەر ڕووەكەی) یەكسانن، جا ئەو خاڵەی نیوەتیرەكەی تێدا كۆتایی دێت بەرزترین خاڵی چیایەك بێت یان نزمترین خاڵی نێو قوڵایی و بنكی زەریا بێت.

شیكردنەوەی ئەم ڕاستییە زانستییە تەنها بە لێكۆڵینەوەی چڕیی بەردە پێكهێنەرەكانی بەشە جیاوازەكانی بەرگی بەردینی زەوییەوە دەبێت، بۆیە دەبێت زنجیرە چیا بەرزەكان لە بەردی چڕیی كەمتر لە بەردەكانی دەوروبەریان پێكهاتبن، دەبێت ناوچە نزمەكانیش لە بەردی چڕیی زیاتر وەك لە چڕیی بەردەكانی پێكهاتەی ناوچە بەرزەكان پێكهاتبن. ئەم ڕاستییە دڵنیایی ئەوە دەدات كە بەشی سەرەوەی بەرگی بەردینی زەوی (تـوێكڵی زەوی)، هەریەكە لە ئەستووریی و چڕییەكەی جیاوازە لە كیشوەرەكان لەلایەكەوە و لە بنی دەریا و زەریاكاندا لەلایەكی ترەوە (لە پێشەوە باسكراوە).

توێکڵی زەوی لە کیشوەرەکاندا زۆرینەی پێکهاتەی بەردی گرانیتە کە چڕییەکەی کەمترە لە چڕیی بەردی بازیلتی کە توێکڵی بنی زەریای لێپێکدێت، هەر لەبەر ئەم جیاوازییە لە چڕیدا بارستەی کیشوەرەکان سەردەکەونە سەر بنی دەریا و زەریاکان، هەر دوو جۆری چینی تەختی بەرگی بەردینی زەویش (کیشوەری و زەریایی) سەردەکەونە سەر پشتێنەیەکی چڕیی زیاتری نیمچە تواوەی لینج کە پێیدەوترێت پشتێنەی لاوازی زەوی.

کاتێك شاخ بە بەردە تاڕادەیەك سووکەکانیەوە بە ئاڕاستەی لوتکەکانی بەرزدەبێتەوە، بڕێکی یەکسان لە بارستەکەی دێتە دەرەوە لە ماددە نیمچە تواوەکەدا کە ڕاستەوخۆ لەژێر شاخەکاندا هەیە و یارمەتی بەردی پێکهاتەی شاخەکان دەدات بۆ ڕۆچوون و درێژبوونەوەی قووڵ، بەشێوەیەك کە بەتەواوی بەرگی بەردینی زەوی دەبڕێت، زانراویشە کە بەشی دیاری شاخەکان لەسەر ڕووی زەوییەوە ئەندازەی قوڵیی درێژبوونەوە ناوەکییەکانی بەرگی بەردینی شاخەکە (واتە درێژی بەرگەکە) دیاری دەکات.

بەمجۆرە بەهۆی درێژبوونەوەی بەردەکانی بەنێو بەرگی بەردیدا و سەرکەوتنی لەسەر پشتێنەی لاوازی زەوی، شاخ لەسەر ڕووی زەوی جێگیر دەبێت.

دووەم/ ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾ بەمانای:

**جێگیرکردن و لەنگەرگرتنی زەوی بەهۆی شاخەکانەوە**

شاخ یارمەتی جێگیربوون و چەسپاندنی زەوی دەدات وەك هەسارەیەك و کاردەکاتە سەر کەمکردنەوەی جوڵەی نائاسایی زەوی لە سوڕانەوەی

بەدەوری تەوەرەكەیدا، هەروەها شاخ بەهۆی مێخێتیەوە (درێژبوونەوەی بنی شاخەكان بە زەویدا) چینە تەختەكانی بەرگی بەردینی زەوی لەگەڵ یەكتردا دەچەسپێنێت و كیشوەرەكانیش بە بنی زەریاكانەوە دەبەستن، هەر بۆیە شاخەكان دەبنەهۆی جێگیركردن و لەنگەرپێگرتنی زەوی وەك یەك بارستە، ئەم ڕاستیەش لە دوو خاڵدا دەردەكەوێت:

أ- چەسپاندن و جێگیربوونی چینە تەختەكانی بەرگی بەردینی زەوی بەهۆی شاخەكانەوە:

شاخەكان ڕۆڵێكی گەورە دەبینن لە چەسپاندنی چینە تەختەكانی بەرگی بەردینی زەوی و جێگیركردنیان.

چینە تەختەكانی بەرگی بەردینی زەوی جوڵەیان هەیە وەك كاردانەوەیەك بۆ ئەو گەرمییەی دەگاتە ژێرەوەی ئەم بەرگە، یاخود دەگونجێت كاردانەوە بێت بۆ خێرایی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری تەوەرەكەی لەبەردەم خۆردا، بەتایبەت ئەوەی كە ئەم خێراییە پێشتر لەم تێكڕاییانەی ئێستای زۆر زیاتر بووە و بەردەوامیش لە كەمبووندایە بەهۆی بەردەوام دروستبوونی زنجیرە شاخەكانەوە، شاخی كیشوەرەكان لەئەنجامی بەریەككەوتنی چینە تەختەكانی بەرگی بەردینەوە لەگەڵ یەكتردا دروستدەبن، جا ئەو بەریەككەوتنە لەنێوان دوو چیندا بێت یەكێكیان دەریایی و ئەوی تر كیشوەری بێت یان هەردووكیان كیشوەری بن. بەمشێوەیە جوڵەی دروستبوونی شاخەكان لەكاتی بەیەككەوتنی دوو كیشوەردا دەگاتە لوتكە، كە لەئەنجامی ئەمەوە لۆچبوونی توندی لێواری دوو كیشوەرەكە ڕوودەدات و هەموو جۆرە چالاكیەكی ئەو دوو چینە لە چینە تەختەكانی بەرگی بەردینی زەوی بە درێژایی هێڵی بەیەك گەیشتنی

نێوانیان دەوەستێت، ئیتر پێکەوە دەنوسێن و ڕوویەرەکانیان بە بڕێکی بەرچاو دێنەوەیەك و زیادبوونێکی گەورە لە ئەستوری توێکڵی زەویدا دروستدەبێت لەسەر شێوەی ڕەگی قووڵ کە بەرەو ژێرەوە درێژدەبنەوە بەبڕێك دەگاتە چەندین ئەوەندەی بەرزیی زنجیرە شاخەکان.

لەئاکامدا ئەم زنجیرە شاخانە و ڕەگە قووڵەکانیان کاردەکەنە سەر چالاککردنی بەرگی بەردینی زەوی، بەشێوەیەك کە جوڵەی چینە تەختەکانی بەرگی بەردینی زەوی بەنزیکی دەوەستێت لەو شوێنانەدا کە ئەم زنجیرە شاخانە دروستدەبن.

ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان شاخ و کەشتییدا، زیاتر مەفهومی لەنگەرگرتنی توێکڵی زەویمان بەهۆی شاخەکانەوە بۆ ڕوون دەبێتەوە. ئەگەر بویسترێت کەشتییەك لەئاودا لەنگەر بگرێت، لەنگەرەکەی (مرساة) دادەبەزێنرێتە نێو ئاوی دەریاکەوە، توێکڵی زەوی دەچوێنرێت بە کەشتییەکە و شاخیش بە لەنگەری کەشتییەکە و تواوە بەردینیەکانی ژێر توێکڵی زەویش بە دەریا.

هەر بۆیە شاخەکان لەنگەرن بۆ توێکڵی زەوی و لەنگەر بە توێکڵی زەوی دەگرن، تاوەکو نەجوڵێن و لارنەبنەوە و لەگەڵ جوڵەی بەردەوامی چینە تەختەکانی بەرگی بەردین و تواوەکەی ژێریدا جوڵە بە بەدیهێنراوەکانی سەر زەوی نەکات.

ب- جێگیربوونی هەموو زەوی، وەك هەسارەیەك، بەهۆی شاخەکانەوە:

زاناکان وەڵامی ئەو پرسیارەیان بە "بەڵێ" دایەوە کە: ئایا شاخەکان ڕۆڵیان هەیە لە هاوسەنگکردنی جوڵەی زەوی و جێگیرکردنی تاکو گونجاو بێت بۆ ژیان؟

لـــەئاكامی ســـــوڕانەوەی زەوی بـــەدەوری تەوەرەكەیـــدا هێـــزی دوورخســـتنەوەی ســەنتەری (القــوة الطــاردة المركزيــة) دروســتدەبێت كــە لــەهێڵی یەكســانیدا دەگاتــە لوتكــە، لەبەرئــەوە زەوی لــەهێڵی یەكســانیدا كــەمێك بــەناودا چــووە لەكاتێكــدا كــە هێــزی كێشــكردن كەمــە و هێــزی دوورخســـتنەوەی ســـەنتەریی زۆرە، بـــەڵام لـــە دوو جەمســـەرەكەی زەویـــدا كـــەمێك پـــان بووەتـــەوە، لەوێـــدا هێـــزی كێشـــكردن زۆرە و هێـــزی دوورخستنەوەی سەنتەریی كەمە، هـەر لەبەرئەوەیە درێـژی تـیرەی زەوی لــەهێڵی یەكســانیدا بــە بــەردەوامی زیاددەكــات لەكاتێكــدا كــە تــیرەی جەمســەرەكان كــەم دەكــات، هەرچــەند ئــەم حاڵەتانــە بــە تێكڕاییــەكی زۆر هێــواش ڕوودەدەن، ئـــەم كـــرداره زەویـــی لـــە شـــێوەی گۆییـــەوە بـــەرەو شێوەیەكی نیمچە گۆیی (شێلمی) بردووە.

شێوەی نیمچە گۆیش ناكرێـت سـوڕانەوەیەكی هاوسـەنگ و ڕێكـوپێكی بــەدەوری تەوەرەكەیــدا هــەبێت، چــونكە بەناوداچــوونی زەوی لــە هێڵــی یەكســـانیدا وادەكـــات تـــەوەرەی ســـوڕانەوەكەی وردەوردە لەجوڵەكەیـــدا ئاڕاستەكەی بگۆڕێت. كە بەهۆی كاریگـەری هێـز كێشـكردنی هەسـارەكانی كۆمەڵەی خۆرەوە (بەتایبەت خۆر و مـانگ) دروسـتدەبێت و بەمـەش زەوی جوڵەیەكی ناڕێكی دەبێـت. جوڵـەی نـاڕێكی زەوی بـەدەوری تەوەرەكەیـدا جوڵەیەكی لولپێچی وەردەگرێت، بەهۆی هێزی كێشكردنی هەریەكە لە خۆر و مـانگ بـۆ زەوی و گۆڕانكارییـە بەردەوامـەكان لـە بـڕ و ئاڕاسـتەی هێـزی خولگەیی هەریەكەیاندا.

لێكۆڵینەوە گەردوونییە وردەكان سەلماندوویانە تـەوەرەی سـوڕانەوەی زەوی ژمارەیەك لەرەجوڵەی ناڕێكی هەیە كـە هەریەكـەیان كـاتێكی جیـاواز

دەخایــەنێت، کورتترینیـــان (١٠ ڕۆژە) و درێـــژترینیان (١٨,٦ ســـاڵ) دەخایەنێت.

بەڵام بوونی شاخی ڕەگداری نوقمبوو لە بەرگی بەردینی زەویدا، توندیی لەرەی نارێکی زەوی لـە سوڕانەوەی بـەدەوری تەوەرەکەیدا بەڕێژەیـەکی بەرچاو کەمدەکاتەوە، وا لەجوڵەکەی دەکات زیاتر ڕێکوپێـك و هاوسـەنگ و ئارام بێت.

سێیەم:

## بوونی هێڵ و نەخشەی ڕەنگ جیاواز لەسەر شاخەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾فاطر/٢٧، واتە: ئایا سەرنجتان نەداوە کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بـارانی بارانــدووە و ئێمــە بــەو بارانــە جۆرەهــا بــەروبوومی جیاوازمــان دەرهێنا... هەروەها هەنـدێك لـە کـەژ و کێوەکانمـان بـە زنجیرە کێشـاوە، هەیانە چین و هێڵ و نەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش ڕەنگیان جیـاوازە، هەشیانە ڕەشێکی تاریك و تۆخە.

وشەی (جُدَد) تاکەکەی (جدة)یـە، ئـەویش بـە مانـای ڕێگـا و نیشـانەی جیاوازە، (جُدَد) کۆیەکەیەتی کە ڕێگای ڕەنگ جیـاوازە، لـە ڕافـەی ﴿وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ﴾دا وتــراوە ئـەو ڕێگایانەیـە کـە لـە ڕەنگـی شـاخەکە جیاوازن.

(غرابيب) كۆی (غربيب)ـە، بەمانای زۆر ڕەش دێت، وەك قەلـەڕەش لـە ڕەشیدا... "إبن كثير" دەربارەی ئایەتەكە دەڵێت: "واتـە شـاخەكانی بـە ڕەنگـی جیـاواز بـەدیهێناوە، وەك دەبینرێـت بـە سـپی و سـوور، لەسـەر هەندێكیان ڕێگای ڕەنگ جیاواز (جُدَد) هەیە".

لە (المنتخب في تفسير القرآن)دا هاتووە: لـە شـاخەكاندا شـاخی خـاوەن ڕێگا و هێڵی سپی و سوور و جیاواز هەن لە تێریی و كاڵیدا.

لـە (صـفوة التفاسـير)دا دەربـارەی ئایەتەكـە هـاتووە: واتـە شـاخی بـەدیهێناوە بەهـەمان شێوەی بـەروبووم و درەختـەكان كـە ڕێگـای ڕەنـگ جیاوازی تێدایە –هەرچەند بەرد و خۆڵن– شاخەكان (جُدَد)یان هەیە، واتە: ڕێگا و هێڵی ڕەنگ جیاوازیان هەیە.

## (جُدَد)ی بەردین لەزانستی زەویناسیدا

توێكڵی زەوی بە بەبەردبوونی تەواوەی بـەردین دەسـتی پێكـرد، لێیـەوە بـەردە ئاگرینیـەكان (بـەردە یەكەمیـەكان) پێكهـاتن، ئێسـتا دەوروبـەری (٩٥٪)ی كـۆی بـەردەكانی تـوێكڵی زەوی پێكـدێنن. بـەوەی كـە بـەردە ئاگرینیەكان بەركەوتەبوون بە فاكتەرە جیاوازەكانی ڕامـاڵین و گواسـتنەوە و داخوران، بـە هۆكـارە جیاوازەكـانی وەك: (بـا، ئـاوی ڕۆیشـتوو، بەسـتن، زینـدەوەرەكان و كـاری كێشـكردنی زەوی)، ئـەو بەردانـە پـەرتبوون و بەشێوەیەكی كیمیایی شی بوونەتەوە.

ئـەو پارچـە بەردینیانـەش گوێزراونەتـەوە، تـاوەكو لـە نزماییـەكانی وشكانی و دەریا و زەریاكاندا بنیشن و بپەستێورێن و پێكـەوە ببەسـترێن و ڕەق ببن لەشێوەی بەردی نیشتەنیدا، كە ئێستا بەرگێكی تەنك پێكدێنێت و

بەسـەر ڕووبـەرێکی فراوانـی زەویـدا بڵاوبووەتـەوە لەسـەر شـێوەی بـەردی نیشـتەنی کـە دەورووبـەری تـەنها (٥٪)ی کـۆی بـەردەکانی تـوێکڵی زەوی پێکدێنێت.

هــەروەها بــەهۆی بەرکەوتــەیی هەریەکــە لــە بــەردە ئــاگرینی و نیشتەنییەکان بۆ فاکتەرەکانی گۆڕان –پەستان و پلەی گەرمی یان هەردوو فاکتەرەکە پێکەوە– ئەو بەردانە گۆڕاون بۆ ئەو جۆرەی بـە بـەردی گۆڕاو ناسـراوە، ئێسـتا ڕێژەیـەکی زۆر کـەم لـە کـۆی بـەردی تـوێکڵی زەوی پێکدێنێت.

بـە بەرکەوتـەیی بـەردە گۆڕاوەکـانیش بـۆ بڕێـك گـەرمی دەتوێنـەوە و دەگۆڕێن بۆ تواوەی بەردین و دەگەڕێنەوە بۆ سووڕەکەیان کـە بەسـووڕی بەردەکان ناسراوە.

کاتێك تواوە بەردییەکان لەتوێکڵی زەویدا لە پشتێنەی لاوازی زەوییەوە دەردەپەڕن، یان بەشێوەی شۆڕشی گڕکانی دەردەپەڕنە سـەر ڕووی زەوی یـان دەچـنە نێـو قووڵاییـەکانی تـوێکڵی زەوییـەوە تـاکو دێنەوەیـەك و دەبیەسـتن و بەشـێوەی تێهەڵکێشـراوی ئـاگریی دەبـن، کـە دەگونجێـت جوڵەکانی زەوی بەرەو ڕووی زەوی بەرزیان بکاتەوە، لەو جوڵانەش جوڵەی پێکهـاتنی شـاخ کـە بـەهۆی فاکتـەرەکانی ڕاماڵینـەوە ڕادەمـاڵرێن و پـاش ملیۆنان ساڵ ئەو تێهەڵکێشراوانە دەردەکـەون و دەبینـرێن. تێهەڵکێشـراوە ئاگرییــەکانیش شــێوە و قــەبارەی جۆراوجــۆر وەردەگــرن، لەوانــەش تێهەڵکێشراوە تەختەکان، هەروەها بارستەیی و لەوانەش تەبا هەیـە لەگـەڵ ئەو بەردانەی هاتوونەتە نێویان، ئەوانەش کە ناتەبان.

لـە تێهەڵکێشـراوە تەختــەکان (جُـدد)ــە، کـە لەئـەنجامی دەرچـوونی تواوەکان بـۆ نێـو کـەلێن و نێـوان ئاسـتەکانی جوتبـوون و جگـە لەوانـەش

پێکدێن، لەوانەش (جُدد)ی بڕەڕەکانە ئەگەر ڕاست یان لاربێت و (جُدد)ی تەریب ئەگەر ئاسۆیی یان لار یان تەریب بێت بە ئاستەکانی جوتبوون.

## پێشینەی قورئان لە ئاماژەدان بە ڕەنگەکانی (جُدد) بە ڕەنگی سپی و سوور و ڕەش

ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەدات کە (جُدد) ئەو هێڵ و ڕێگا ڕەنگ جیاوازانەیە کە لەسەر شاخەکان هەن و لە ڕەنگی شاخەکە جیاوازن. زانستە وەدەستهاتووەکانیش دڵنیایی پتر دەدەن لەسەر ئەوەی کە تێهەڵکێشراوە ئاگرییەکان لە بەردی شاخەکان، لەدوای بەردە بنەڕەتییەکانی شاخەکان دروستبووە بە ماوەیەکی درێژ، کە هەندێجار بەملیۆنان ساڵ مەزەندە دەکرێت.

هەروەها لێکۆڵینەوەکانی زانستی بەردەکان سەلماندوویانە کە فاکتەری سەرەکی لە پۆلێن کردنی بەردە ئاگرینیەکان پێکهاتە کیمیایی و کانزاییەکانیانە کە ڕەنگدانەوەیەکی ڕوونیان لەسەر ڕەنگەکانیان هەیە.

بەردە ئاگرینیەکان لەسەر بنەمای پێکهاتەی کیمیایی و کانزاییان دابەش دەکرێن بۆ سێ کۆمەڵەی سەرەکی، کە ئەمانەن:

١. بەردی ترش و سەرو ترش کە خێزانی گرانیت دەگرێتەوە، کە لە بنەڕەتدا لەکانزای کوارتزی سپی و (فلسباری پۆتاسی) ڕەنگ نزیك سوور و (بایۆتایت) کە لەنێوان هەردوو ڕەنگی زەرد و قاوەیی مەیلەوسوور یان هەنگوینیدایە، پێکهاتووە.

٢. بەردی ناوەندیی کە خێزانـی (دایورایـت) دەگرێتـەوە و لـە بنەڕەتـدا لەکەمێك کوارتز و کانزاکانی (بلاجیو کلیزی کلسی و سوودی و ئـەمفیبۆل) پێکهاتووە، ڕەنگەکانی لەنێوان سپی و سوور و خۆڵەمێشیدایە.

٣. بەردی تفت کە هەردوو خێزانی (گابرو– بریدوتایت) دەگرێتەوە و بە ڕەنگە تاریکەکان جیادەکرێتەوە کە مەیلە و ڕەشن، ڕەنگەکەشیان بـەهۆی بوونی هەریەکە لە کانزاکانی ئاسن و مەگنسیۆمە لە پێکهاتەیاندا.

لەمەوە دەردەکەوێت (جُدد) کە دەچێتە نێـو بـەردی شـاخەکانەوە، لـە بنەڕەتدا لەبەردە ئاگرینیەکانە. باشترین ئەو پۆلێنانەش ئـەو پۆلێنەیـە کـە لەسەر بنەمای پێکهاتە کیمیـایی و کانزاییەکانـە کـە ڕەنگدانـەوەی دەبێت لەسەر ڕەنگەکانیان، بەمجۆرەی خوارەوە:

١. بەرد کە ڕەنگەکانیان لەنێوان سپی و سووردایە، ئەویش بەردی ترش و سەروو ترشن کە خێزانی بەردە گرانیتیەکانە (رایولایت– گرانیت).

٢. بەرد ڕەنگەکانیان لەنێوان سپی و سوورە لە ڕوویەکەوە، لە ڕوویەکی ترەوە ڕەنگە تاریکەکان کە ڕەنگـە خۆڵەمێشـیەکانی تێدا زیـاترە، ئەمانـە ئەو بەردانەن کە بە ناوەندیی ناسراون (لەنێوان بەردی ترش و سەروو ترش لەلایەکەوە و بەردی تفت و سەروو تفت لەلایەکی ترەوە)، ئەمـەش خێزانـی (دایورایـت) دەگرێتــەوە و دەکەوێتــە ژێــر ئــەو وەســفەی قورئانــەوە کــە دەفەرموێت: ﴿...مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا...﴾.

٣. بەرد کە ڕەنگەکانی زیاتر مەیلە و تاریکە تاکو ڕەش، ئەمیش بەردی تفـت و سـەروو تفتـە، کـە هـەردوو خێزانـی (بازلـت–گـابرو) و (بریـدوتایت) دەگرێتەوە.

## ئاو و كاریگەریی لەسەر ڕەنگی شاخەكان

هـەروەك ئـاو ڕۆڵێكـی دیـاری هەیـە لەسـەر ڕەنگـەكانی بـەروبووم و درەختەكان، بەهەمان شێوە ڕۆڵیشی هەیە لە دیاریكردنی ڕەنگی بەردەكان و پاشانیش شـاخەكان (بەتـەواوی وەك ئـەوەی لـە ئایـەتی ٢٧ی سورەتی (فاطر)دا هاتووە). ڕەنگی بەردەكان، لە ڕەنگی ئـەو كانزایانـەی پێكهاتـەی بـەردەكانن وەردەگیرێـن، ڕەنگـی كانزاكـانیش وەسـتاوەتە سـەر پێكهاتـە كیمیاییەكەی و بارودۆخی ئەو ژینگەیەی تێیدا پێكدێت، ئۆكسێنراوە یان نەئۆكسێنراوە.

ڕەنگـی كانزاكـانیش بـە هەڵمـژینی بڕێـك وزە یـان شـەپۆلی ڕووونـاكی دەگۆڕێت، لەو كانزایانەی زۆرتر بەم حاڵەتە كاریگەر دەبـن ئـەو كانزایانـەن كە كانزا گوێزراوەكانیان تێدایە وەك ئاسن و كرۆم و مەنگەنیز.

لەبەرئەوەی ئاو لەسروشتدا لە شلەكانی تر زۆرتر بڵاوە، بەتایبـەت شـلە چـڕیی كەمـەكان و توێنـەرێكی چـاكە و لـە شـلەكانی تـر زیـاتر توانـای گواستنەوەی هەیە و باشترین فاكتەری یاریـدەدەرە لـە كارلێكـەكانی كـانزا سـیلیكاتیەكان لـە تـواوەی (ماگمـا)دا، هـەروەها باشـترین هۆكـاری یاریدەدەریشە لە گۆڕینی بەردی ئاگرین یـان نیشـتەنی بـۆ بـەردی گۆڕاو، بۆیە ئاو لە دیاریكردنی ڕەنگی بەردەكاندا بەشـدارە، بـەوەی دەچـێتە نێـو كرداره جیۆلۆجیە دەرەكی و كردارە جیۆلۆجیە ناوەكییەكانەوە.

كـرداره دەرەكییـەكان بـۆ ڕوودانیـان وزەی پێویسـت لـە خـۆرەوە وەردەگرن، لە گرنگترین ئەو كردارانـە تەجویـە (Weathering) و كـرداری نیشتنە (Sedimentation). هەروەها ئاو ڕۆڵی هەیـە لـە گـۆڕینی ڕەنگـی كانزاكـانی وەك: فلسـبار و بیرۆكسـین و هورینلنـد و لـە ئۆكسـاندنی كـانزا

ئاسنیەکان، بۆنموونە: لە ئۆکسیدەکانی ئاسنی ئاوییە و کانزای جیوسایت (Geothite) بەرهەم دێنێت، ئەمەش لەو ئۆکسیدانەیە کە ئەو پێکهاتە ئاوییەی تێدایە، ڕەنگی ئەو کانزایانە دیاری دەکەن کە لێوەی بەرهەم دێن. ئاو ڕۆڵێکی گرنگ و پێویست دەبینێت لە گۆڕینی ژمارەیەك لە کانزا یەکەمیەکان بۆ کانزای ناوەندیی خاوەن پێکهاتەی کیمیایی و ڕەنگی جیاواز.

لەگەڵ ئەمانەدا ڕۆڵی ئاو لە گۆڕینی ڕەنگی بەردەکان و پاشان ڕەنگی شاخەکان لە ڕێگای بەشدارییەتی لە کردارەکانی نیشتن، ئەوەش ڕۆڵێکی زۆر ئاشکرایە کە کانزاکان لەئەنجامی کرداری هەڵمیندا ڕێك دەبن و ڕەنگێکی دیاریکراو وەردەگرن کە ئەوەش وەستاوەتە سەر ئەو بڕە ئاوەی تێیدایە، وەك: ئەنهێدریت و جیپسۆم.

بەکاری کردارەکانی (تەجویە)ش نیشتوی لینج دروستدەبن و بە ئاودا دەڕۆن و بە ئایۆناتی دیاریکراو نوێ دەبنەوە، بەهەمان شێوە ژمارەیەك لەماددەی لکێنەر دروست دەبێت کە دەنکۆڵە گوێزراوەکان بەرەو حەوزەکانی نیشتن پێکەوە دەلکێنن، بەمەش بەردەکان ڕەنگێکی جیاکراوە وەردەگرن، لەو بەردانەش بەردی لمینی ئاسنیە.

وەك چۆن کرداری جیۆلۆجی دەرەکی هەیە و ڕەنگی بەردەکان نوێ دەکاتەوە، بەهەمان شێوە کرداری جیۆلۆجی ناوەکیش هەیە، ئەویش ئەو کردارانەیە کە وزەی پێویست بۆ ڕوودانیان لە ناواخنی زەوییەوە وەردەگرن، تیایاندا ماددەکان لە تواوەکەوە دروستدەبن، بەدوایدا ئاو، کە لەپێکهاتەی تواوەکەیە، ڕۆڵی گەورەی هەیە لە سەرجەم قۆناغەکانی پێکهاتنندا، وەك: دابەزاندنی پلەی گەرمی پێکهاتووەکە و کاریگەری لەسەر لینجێتی تواوەکە و پاشان دەرچوونی بەشێوەی بەردی گڕکانی لە

زەوییــەوە، یــاخود مانــەوەی لــە زەویــدا تــاکو لــە قولاًییەکانیــدا پێکبــێن. هەروەها کاریگەریی لەسەر پلەی ئۆکسانی ئاسن هەیە و لەسەر دیاریکردنی گۆڕینی ڕێژەی (ئاسنیك) بۆ (ئاسنۆن)، ئەمــەش ئــەو ڕێژەیەیــە کــە ڕەنگــی بەردە گڕکانییەکان دیاری دەکات.

هــەروەها چــوونە پێکهاتــەی زۆر جــۆری کریســتاڵ کــە لەتەواوەکــە جیادەبنــەوە و بەرزبوونــەوەی ڕێژەکــە لــە تەواوەکــەدا دەبێتــەهۆی دروستبوونی کانزای نمونەی (ئەمفیبۆل و مایکا) و کەمیشی لە کریستاڵە دروستبووەکاندا دەبێتەهۆی چڕیی توخمە بەهاداری ئابوورییەکان بۆ مرۆڤ لە گیراوە گەرماوییەکانــدا، کە لێیانــەوە کۆمەڵە کانزایــەکی ڕەنــگ جیــاواز دەنیشن.

هــەروەك چــۆن ئــاو ڕۆڵــی هەیــە لــە دیــاریکردنی ڕەنگــی بەردەکانــدا لــە کــرداره جیۆلۆجیــە دەرەکــی و کــرداره جیۆلۆجیــە ناوەکییــەکان، ڕۆڵیشــی هەیــە لــە دیــاریکردنی ڕەنگــەکانی لــە کردارەکــانی گۆڕانــدا، ئەمــەش ئــەو کردارانەن کە لەتوێکڵی زەویدا ڕوودەدەن و گۆڕان لە هەریەك لە پەستان و گەرمیــدا هــاوڕێی ئــەم گۆڕانــە دەبــن و تیایــدا کانزاکــان دەگــۆڕێن، یــان پێکهاتــەی کیمیــایی و ســیفەتە فیزیاییــەکانیان دەگۆڕێــت، بەدوایــدا ڕووخساری دەرەوەی بەردەکەش دەگۆڕێت.

## چوارەم:

# جوڵەی شاخەکان

# شوێنکەوتەی جوڵەی زەوییە

خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾النمـل/٨٨، واتـــە: تـــۆ کێوەکان دەبینیت وادەزانیت وەستاون و بێ جوڵـەن، لەکاتێکدا ئـەوانیش وەکو هەور لە جوڵەدان، ئەمەیە دەستکردی ئـەو خوایـەی هـەموو شـتێکی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

"حەنەفی ئەحمەد" دەربارەی ئـەم ئایەتـە دەڵێت: (جامدة) بـەمانای وەستاو و نەجوڵاو دێت، (مَرّ)یش مانای ڕۆیشتن و دەرکەوتنەوە دێت، بۆیە مانای ئایەتەکە بەمجۆرەی لێدێت: دەڕوانیتە شاخەکان و تۆیش کە لەسـەر زەویت وەها هەست دەکەیت وەستاوە و ناجوڵێت، بەڵام لەڕاستیدا شاخ و هەوەرەکانیش پێکەوە دەڕۆن و لە جوڵەدان و دووردەکەونەوە، بەوەش کە شاخەکان بەشێکن لـەزەوی و جـێگیرن لەسەری، بۆیـە ئایەتەکـە بـەڕوونی باس لەوە دەکات زەوی و ئـەوەش کـە لەسـەریەتی لـە شـاخەکان، لەگـەڵ هەوەرەکان و هەوای سەریدا دەجوڵێن و دووردەکەونەوە، واتە لە بۆشاییدا بەخێرایی خۆی دەگوێزێتەوە.

ئەم ئایەتە ئاماژە بە جوڵەی شاخەکان دەدات، کە هاوکات و گرێدراوی جوڵەی زەوییە، ئایەتەکە دڵنیـایی ئـەوە دەدات کـە زەوی دەجوڵێـت و لـە

شوێنی خۆی دەگوێزرێتەوە، ئەم جوڵە و ڕۆیشتن و گوێزانەوەیەی زەویش لـە خولگـەی تایبەتیدایـە بـەدەوری خـۆردا، زەوی بـەدەوری خـۆردا دەسوڕێتەوە و ئەم سوڕانەوەیەش ڕۆیشتن و بەرەو پێشەوەچوونی هـەموو ئەو شتانەشە کە لەسەری هەن، شاخەکانیش بەشێکن لە زەوی.

لە ئایەتەکەدا هاتووە کاتێك دەڕوانیتە شاخەکان وەهـا گومـان دەبـەیت وەستاوە، بەڵام لەڕاستیدا ﴿تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِۚ﴾، وەك هەوەرەکان لەجوڵەدان. لێرەدا ئامـاژەی ئایەتەکـە وەهایـە کـە جوڵەکـە وەك هەورەکانـە، چـونکە هـەوەرەکان جوڵـەی خودییـان نییـە، بـەڵکو هێزێـك لـە دەرەوەی خۆیـان پاڵیان پێوە دەنێت، ئەویش هێزی (با)یە. بۆیـە کـە هـەور دەجوڵێـت (بـا) هەڵیدەگرێت و دەیجوڵێنێت، بەهەمان شـێوە شـاخەکانیش خۆیـان توانـای ئەو جوڵەیەیان نییە کە هەیانە و وەك هەوەرەکان دەجوڵێن، واتە: جوڵـەی زاتییان نییە، بـەڵکو بەهۆی جوڵـەی زەوییـەوە دەجـوڵێن، بەتـەواوی وەك جوڵەی هەورەکان کە بەهۆی (با)وەیە.

کەواتە زەوییە دەجوڵێت، بەجوڵەیەکی زاتیی دەجوڵێت و شـاخەکانیش شوێنکەوتەی ئەو جوڵەیەن، ئەمەش ئاماژەیە بە جوڵە و سوڕانەوەی زەوی کە لە زانیارییە چەسپاو و سەلمێنراوەکانی زانستی ئەمڕۆیە.

# ئاو بنەڕەتی ژیانە

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾الانبياء/٣٠، واتە: لە ئاو هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟

زانسـت ئـەو ڕاسـتییەی سـەلماندووە کـە بنـەڕەتی ژیـان ئـاوە، بـەڵکو ماددەی سـەرەکییە لـە دروسـتکردنی هـەموو شـتێکی زینـدوودا، بنـەڕەتی هەموو شتێکە، ڕەگەزی یەکەمە بۆ هەموو خانەیـەکی زینـدوو کـە هـەر لـەو خانەیەوە ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤیش پێکدێت.

کاتێـك زانایـان لێکۆڵینـەوە لەسـەر ئەگـەری بـوونی ژیـان لەسـەر هـەر هەسارەیەك دەکەن، سەرەتا ئەو پرسیارە دەکەن: ئایا ئەم هەسارەیە بڕی پێویستی ئاوی تێدایە؟

قورئانی پیرۆز لەبارەی بنەڕەتی ژیانەوە لە هێڵێکی گشتیدا دەربـارەی ناسنامەی ئاو دەدوێت بەوەی یەکەم بنەڕەتی ژیانە، دووەم جیهانی ڕووەك و زۆربوونی و ئەو هاوسەنگیەی تێیدایە، سێیەم جیهانی ئاژەڵ و پاشـانیش جیهانی مرۆڤ کە بە (نوتفە)یەك دەستپێدەکات تا تـەواوبوونی بـەدیهێنان و پێکهاتەو جەستەی .

زانسـتی (کیمیـای ژیـانی) سـەلماندوویەتی ئـاو پێویسـتە بـۆ ڕوودانـی سەرجەم ئەو کارلێك و گۆڕانکارییانەی لـە لەشـی زیندەوەرانـدا ڕوودەدەن،

جا ناوەندە یان کارای یاریدەدەر، دەچێتە کارلێکەوە یاخود بەرهەمێکی کارلێکەکەیە. هەروەها زانستی کارئەندامزانی (فسیۆلۆژیا) سەلماندوویەتی ئاو پێویستە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکان لەلایەن هەر ئەندامێکەوە، بەبێ ئاو هیچ ڕووخسار و بنەمایەکی ژیان دەستەبەر نابێت.

ئاو بنەمای پێکهاتەی خانەیە، خانەکانی خوێن و شلەی لیمفی و دەردراوەکانی لەش وەك میز و ئارەق و فرمێسك و ئاوی زراو و شیر و شلەی جومگەکان. هەروەها ئاو هۆکاری نەرمونیانی جەستەیە و ڕێژەی (٦٥-٧٠٪)ی کێشی لەشی مرۆڤ پێکدێنێت. مرۆڤ دەتوانێت نزیکەی (٦٠ ڕۆژ) بەبێ خواردن بژی، بەڵام ناتوانێت (٤ ڕۆژ) زیاتر بەبێ ئاو بژی.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ النور/٤٥، واتە: خوا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاو دروستکردووە، هەیە لەسەر سکی دەڕوات، هەیشە لەسەر دوو قاچ دەڕوات، هەیشە لەسەر چوار پێ دەڕوات، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

## بنەڕەتی مرۆڤ ئاوە:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ٥ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ٦ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ﴾ الطارق/٥-٧، واتە: با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات لەچی دروستکراوە؟ دروستکراوە لە ئاوێکی هەڵقوڵاو، لەنێوان بڕبڕەکانی پشتی پیاو و ئێسکەکانی سینەی ئافرەت دەردەچێ.

## بنەڕەتی ڕووەك ئاوە:

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾النحل/١٠-١١، واتە: پەروەردگار ئەو زاتەیە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت کە لێـی دەخۆنەوە، هەروەها تێکەڵ بە جۆرەها شەربەت و شلەمەنیش دەیخۆنـەوە و دەبێتـەهۆی گەشـەکردنی درەخـت و گـژوگیا و مـاڵاتی تیـا دەلـەوەڕێنن، هەروەها بەو بارانە جۆرەها کشتوکاڵ دێتە بەرهەم لەگەڵ زەیتون و خورما و ترێ، لە هەموو جۆرە بەروبوومێك، بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگـە و نیشـانەی تەواو هەیە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

قورئانی پیرۆز دەربارەی گەلێك سوودی ئـاو بـۆ ژیـانی مـرۆڤ دەدوێـت، لەوانە:

١- بـەکارهێنانی ئـاو بـۆ خواردنـەوە و ئاوداشـتن: ﴿فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ﴾الحجر/٢٢، واتە: باران لە ئاسمانەوە دەبـارێنین و ئێـوەی پـێ تێراو دەکەین .

٢- دەرکردنی دانەوێڵەو ڕووەك و باخ لە زەوییـەوە: ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا ﴿١٤﴾ لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ حَبّٗا وَنَبَاتٗا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا﴾النبأ/١٤-١٦، واتە: لە هەورە گوشراوەکان بارانێکی زۆرمان باراندووە، تا بـەهۆی ئـەو بارانـەوە جۆرەهـا دانەوێڵە و ڕووەك بڕوێنین، باخی چڕوپڕ و لەیەك ئاڵاو بەدی بێنین .

٣- زیندووبوونـەوەی زەوی پـاش وشـکبوونەوە و مردنـی: ﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ﴾النحل/٦٥، واتـە: هـەر خـوا بـاران لـە ئاسمانـەوە دەبارێنێـت و زەوی پـێ زینـدوو دەکاتـەوە دوای ئـەوەی کـە مردبوو .

٤- بەکارهێنانی ئاو بۆ پاکردنەوە و لابردنی پیسی کە توشی مرۆڤ دەبێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾الفرقان/٤٨، واتە: هـەر ئێمـەین ئـاوێکی پـاك و خاوێن لە ئاسمانەوە دادەبەزێنین .

٥- دەرکردنـی بـەروبووم و ڕۆزی مـرۆڤ و ئـەوەش کـە خـوای گـەورە بـۆی ڕامکـردووە لـە ئـاژەڵان: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ﴾إبراهیم/٣٢، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، لە ئاسمانەوە بـارانی بارانـدووە و بەهۆیەوە بەروبومی لە ناخی زەوی بۆ ئێوە دەرهێناوە .

٦- زیندویەتی هەمووشتەکان بەهۆی ئـاوەوە: ﴿مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾الأنبیاء/٣٠، واتە: لە ئاو هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە.

# سوڕی ئاو لە سروشتدا

سوڕی ئاو سیستمێکی بازنەیی بەردەوامی ئاوە لەو ناوچە ئاوییەی کە وزەکەی لەخۆرەوە وەردەگرێت، ئەو ناوچانەش لەسەر یان لەژێر زەویدا هەن و لەنێوانیاندا ئاو هەیە، جا بەشێوەی شل بێت یان بە بەستوویی. بەمجۆرە سوڕی ئاو سەرجەم بەشەکانی ناوچەی ئاویی پێکەوە دەبەستێت و درێژدەبێتەوە بۆ سەرەوەی کەش بە دەوروبەری (١٥ کیلۆمەتر) و بۆ خوارەوەش دەوروبەری (١ کیلۆمەتر).

تیشکی خۆر بەر ڕووی زەوی دەکەوێت و دەبێتە هۆکاری بەهەڵمبوونی ئاوی زەریاکان بەشێوەیەکی سەرەکی و لەدەریا و ڕووبار و جۆگەکان و خاکی لمینیشەوە.

ئەو فاکتەرە سەرەکیانەی کاردەکەنە سەر بەهەڵمبوون بریتین لە گەرمی و خێرایی (با) و بڕی هەڵمی ئاو لە هەوادا و ڕووبەری ڕووی ئاوەکە.

هەڵمی ئاو وەك سیفەتێکی گشتی نەبینراوە، مەگەر بەرەنگاری چڕبوونەوە ببێت و هەور دروستبکات یان بەشێوەی شێی سەر زەوی بێت. لەگەڵ بارودۆخی گونجاوی کەشدا دەگونجێت چڕبوونەوەکە ببێتەهۆی باران یان بەفر بارین، کاتێکیش دەگاتە سەر زەوی لەسەر ڕووەکەی وەك دەریا یان لافاو تێدەپەڕێت. دەشگونجێت بچێتە نێو خاکەوە لەنێوان دوو چینی جیاوازدا، یان بدەڵێت بۆ ڕووی ئاوی نێو زەوی، کە لەدواییدا ئاوەکە لەڕێگای ڕووبارەکانەوە جارێکی تر بەرەو زەریاکان دەجوڵێت و بەم شێوەیە سوڕەکە بەردەوام دەبێت.

## بنەڕەتی ڕووبار و سەرچاوەکان و چۆنیەتی باسکردنی ئەم بابەتە لە قورئاندا:

ئاوی ژێر زەوی لە جوڵەیەکی بەردەوامدایە، هەرچەند زۆر هێواشە. تۆڕەکانی دەریاکان ئاسایی لەڕێگای باران بارینەوە ئاوەکەیی دەستدەکەوێت لەسەر ناوچەیەکی گەورە کە ناسراوە بە (کۆکەرەوەی بارانەکان)، بەڵام ئەمە جیاوازە لەوەی لە ڕابردوودا هەبووە. لەکاتێکدا کە فەیلەسوف و لێکۆڵەرەوانی زانست بیریان لە تیۆرە جیاوازەکانیان دەکردەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندووە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ﴾المؤمنون/١٨، واتە: هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بارانمان باراندووە و دوایی لە ناو زەویدا جێگیرمان کردووە و ئێمە بەجۆرەها شێوە دەتوانین ئەو ئاوە لەناو ببەین و ئەو سەرچاوانە وشك بکەین.

ئایەتەکە هەواڵمان دەداتێ کە ئاوی بارانەکان دەچنە خاکەوە و دەمێننەوە، دەشگونجێت ببنە ئاوی ژێر زەوی، لە کاتێکدا لەوانەیە چەند هەفتەیەك بمێننەوە یاخود چەند هەزاران ساڵێك.

وشەی (سَكَنْ) واتە (هێمنی و جێگیربوون) ئەمەش باشترین وەسفە بۆ ئاوی ژێر زەوی کە وا دیارە لە قوڵاییە تاریکەکانی زەویدا بەبێ جووڵە جێگیر بن.

ئایەتێکی تری قورئانی پیرۆز ڕوونکردنەوەیەکی زۆر ئاشکرا دەدات لەسەر بنەڕەتی سەرچاوە و دەریاکان، وەك دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾الزمر/٢١، واتە: (ئەی مرۆڤ)

ئايا نابينى خوا لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت، لەوەودوا لە زەويدا كۆى دەكاتەوە، دوايى بەشێوەى كارێز و كانى دەريدێنێت.

(ينابيع) كەناڵ و ڕێڕەوى ئاوين كە لە ناواخنى زەويدان، ياخود ئەو شەبەق و كەلێنانەى ئاوى تێدا دەتەقێت و دەردەچێت بۆ سەر ڕووى زەوى لەسەر شێوەى جۆگە و دەريا و سەرچاوەكان .

بەم پێيە قورئانى پيرۆز وەسفێكى وردى سەرچاوە و دەرياكان دەكات كە لە باران بارينەوە دروستدەبن.

بڕى ئاوى باران كە دادەبارێتە سەر زەوى، زۆر كەمە ئەگەر بەراوورد بكرێت بە بڕى ئاوى خوێدار كە بۆ خواردنەوە دەست نادات، بەڵام لەدواى لێكۆڵينەوە و زمێركارى وردى سەرچاوە جيهانييەكانى ئاو ئەوە ڕوون بووەتەوە كە مرۆڤ هێندە ئاوى هەيە بەشى پێداويستييەكانى بكات. خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ ﴾الحجر/٢١-٢٢، واتە: هيچ شتێك نييە (لە بەهرە و ناز و نيعمەتەكان) كە گەنجينەكانى لاى ئێمە نەبێت، ئێمە نايبەخشين بەئەندازەى دياريكراو نەبێت، ئێمە (با)مان كردووە بەهۆى پيتاندنى ڕووەك و دارودرەخت، هەر بەهۆى (با)وە باران لە ئاسمانەوە دەبارێنين و ئێوەى پێ تێراو دەكەين، بێئەوەى ئەو ئاوانەتان زەخيرە كردبێت .

خواى گەورە پێويستييەكانى بەندەكانى دەزانێت و بڕى تەواوى بەزەيى خۆييان بۆ دەنێرێت، ئەگەر ڕێژەى باران كەم يان زيادى كرد ئەوا يادمان دەخاتەوە ناتوانين شتێك بۆ خۆمان بكەين، بەڵكو پەروەردگارە بەتوانايە بەسەر هەموو شتێكدا .

# گەرمی و هەڵم

خـوای پـەروەردگار دەفـەرمویت: ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا﴾النبأ/١٣-١٤، واتـە: (ئایـا) چـرایەکی پرشـنگدارمان بـۆ فەراهەم نەهێناون؟ لە هەورە گوشراوەکان بارانێکی زۆرمان نەباراندووە؟

ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە دوو شت پێکەوە گرێ دەدات، ئـەو گەرمییـەی خۆر ڕووەو زەوی تیشکی دەدات لەگەڵ بارینی باران لە هەورەکانەوە.

سوڕەکە بە گەردە بەهـەڵمبووەکانی ئـاوی ڕووبـار و دەریـا و زەریاکـان دەست پێدەکات کە لەئەنجامی گەرمی دەرچوو لـە (سـراج الوهّـاج– چـرای پرشنگدار) کە خۆرە، کرداری بەهەڵمبوونەکە ڕوودەدات. واتە دوای ئـەوەی دەریـا و زەریاکـان توشـی بەرزبونـەوەی پلـەی گـەرمی دەبـن، بڕێـك لـە ئاوەکەیان لەشێوەی هەڵمدا بەرەو ئاسمان بەرزدەبێتەوە.

دەبێ گەردەکانی ئاو بچووك و هەڵوەشاوە بن، هەڵوەشانەکەش بـەهۆی شـەپۆلە سـەرودەنگیەکانەوە دەبێـت کـە لـەزەوی و بوونـەوەرەکانی و سروشتە تایبەتییەکەیەوە دەردەچن، کاتێکیش ئەم گەردانـە سـەردەکەون دەگەنە چینێك (لەچینەکانی بەرگەهـەوای دەوری زەوی) کـە پێیـدەوترێت (ترۆپۆسفێر) و شـانۆی ململانێـی (بـا) و گۆڕانـە کەشـییەکانە. لەوێـدا ئـەو ئاوەی لە شێوەی هەڵمدا و بـەهۆی گـەرمی خـۆرەوە لـە دەریـا و ڕووبـار و زەریاکانـەوە بەرزبووەتـەوە، چـڕدەبێتەوەو بـە ویسـتی خـوا دووبـارە بەشێوەی باران دادەبارێتەوە سەر زەوی .

# هەورەقورسەكان

زانايان بۆيان دەركەوتووە كە جۆرێك لە هەورەكان بارستاييان دەگاتە (٣٠٠ هەزار تەن) و بگرە زياتريش، ئەو هەورەی پێيدەوترێت (Cumulo-nimbus) لەمجۆرە هەورەيە.

ئەوەی شايانی باسە ئايەتی (٥٧)ی سورەتی (الأعراف) باسی هەورەقورسەكان دەكات و دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ الأعراف/٥٧، واتە: هەر ئەو زاتەيە بای شەماڵ (هەڵگری هەڵمی ئاو) دەنێرێت پێش ئەوەی ڕەحمەتەكەی دابارێنێت (كە ئاوی بارانە و سەرچاوەی ژيانە) هەتا وايلێدێت ئەو بايە هەوری سەنگين و قورس هەڵدەگرێت، ئەوسا دايدەبارێنين بەسەر ناوچە و وڵاتێكی مردوودا (بەو شێوەيە) ئاوی بارانی بۆ دەبارێنين. جا بەهۆی (ئەو ئاوەوە) هەرچی بەروبوومە دەريدێنن، هەر بەو شێوەيە، مردوانيش لەناخی زەوی دەردێنين و (زيندووتان دەكەينەوە)، بەڵكو ياداوەری وەربگرن .

# بارانی شیرین

لـە ئايەتـەكانی (٦٨-٧٠)ی سـورەتی (الواقعـة)دا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾، واتە: ئايا سەرنجی ئەوە نادەن كە ڕۆژانـە چـەند جـار دەیخۆنـەوە، ئايا ئێـوە داتـان بەزانـدووە لـە هەورەكانەوە يان ئێمە دابەزێنەرين؟ ئەگـەر بمانـەوێت ئـەو ئـاوە دەكەينـە خوێيەكی تاڵ و سوێر، ئايا ڕەوا نييە شوكرانەبژێر و سوپاسگوزار بن؟

خوای گەورە باس لە ئاوی شـيرين و سـازگاری دابـەزيوو لـە ئاسمانـەوە دەكـات و دەفـەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا﴾المرسلات/٢٧، النحل/١٠، واتە: لەسەر گۆی زەوی كێـوی لوتكـە بڵنـدمان دامەزراندووە و ئاوی سازگارمان پێشكەش كردوون بۆ خواردنەوە.

ئاشكرايە سەرچاوەی ئاوی باران كرداری بەهەڵمبوونـە و (٩٧٪) ی ئـەم بەهەڵمبوونەش لە ئاوی زەريا خوێدارەكانەوەيە، ئەی چۆن ئاوی ئەو بارانە شيرين دەبێت؟

هۆكارەكەی ئەوەيە كە ئاو لەكاتی بەهەڵمبوونيـدا، جـا لـە زەرياكانـەوە بێت يان لە ئەستێڵ ياخود لە قوڕاوەوە، بەهيچ جۆرێك جـۆرە ماددەيـەكی نامۆی تر لەگەڵ خۆيدا ناگوێزێتەوە، بۆيە ئاوێكی بێگەردە و دوورە لە هـەر خەوش و ماددەيەكی نامۆ بە ئاوەكە تا سروشـتە بنەڕەتييەكـەی بگۆڕێت، بۆيە كە دووبارە دەبارێتەوە سەر زەوی، ئاوەكەی پاك و بێگەردە.

# دابەزاندنی باران بە ئەندازەی دیاریکراو

لە ئایەتی (١١)ی سورەتی (الزخرف)دا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ﴾. ئەم ئایەتە باس لە دابەزاندنی باران دەکات بە ئەندازەی دیاریکراو. لەڕاستیدا هەر ئەوەیە کە هەنووکە لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی کەشناسیدا بڕی باران دەپێورێت و تۆمار دەکرێت.

لێرەدا زۆر بە کورتی لە دوو ڕەهەندی ئەم باسە دەدوێین.

## یەکەم: خێرایی دابەزین

زاناکان هەستان بە پێوانەکردنی خێرایی گەیشتنی دڵۆپە باران لە بەرزایی (١٢٠٠مەتر)ەوە کە بەرزی هەورەکانە (لە بۆشایدا) بۆ سەر زەوی، بۆیان دەرکەوت دڵۆپەکە (لەحاڵەتی ئاسایی و بەبێ بوونی هەوا) بەخێرایی (٥٨٨) کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا دەکەونە خوارەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئێستا بەخێرایی (٨-١٠) کیلۆمەتر لە هەر کاتژمێرێکدا دەگەنە زەوی، هۆی ئەمەش (با) و لێکخشاندنی هەوایە کە لەخێرایی دڵۆپەکە کەمدەکەنەوە.

خۆئەگەر ئەو دڵۆپە ئاوە بەبێ بەرگری هەوا و (با) بکەوێتە خوارەوە، ئەوا خێراییە بنەڕەتییەکەی یەکسان دەبێت بە کەوتنەخوارەوەی یەك کیلۆگرام لە بەرزایی (١٥) سانتیمەترەوە (بۆ هەر دڵۆپێك)، لەگەڵ ئەو زانیارییەی هەوری باراناوی هەیە لە بەرزایی (١٠) هەزار مەتردا، بێگومان

کەوتنــەخوارەوەی دڵۆپێـك بـاران لـەم هەورانــەوە هاوتــا دەبێــت بــە کەوتنەخوارەوەی یەك کیلۆگرام لەبـەرزایی (١١٠) سـانتیمەترەوە. کەواتـە بڕوانە ئەندازەگیری و هاوسەنگی .

## دووەم: بڕی بەهەڵمبوو و بڕی باران

بـڕی بەهـەڵمبوونی ئـاوی سـەر زەوی لەیـەك چـرکەدا دەگاتـە شـانزدە ملیۆن تەن، ئـەم ژمارەیـەش یەکسـانە بـەبڕی بـاران بـارین بـۆ سـەر زەوی لەهەمان ئەو چرکەیەدا (لە کۆی هەموو جیهانـدا، ئەمـەش ئەندازەگیریـەکی تری نایابە.

# چینەکانی بینین لە قولآیی دەریادا

ڕاستەقینەی بوونی شەپۆل لەسەر شەپۆل لەدوای دروستکردنی سەدان وێستگەی دەریایی و وێنەگرتن بە مانگە دەستکردەکان، زانایان پێی گەیشتوون. ئەو کەسەی ئەم ڕاستییەی باسکردووە پرۆفیسۆر "شرایدەر"ە کە لە گەورەترین زانا دەریاناسەکانە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، پرۆفیسۆر وتویەتی: "کاتێك زانست پێشدەکەوێت، دەبێت ئایین بکشێتە دواوە"، بەڵام کاتێك مانای ئایەتەکانی قورئانی بیست، سەرسام بوو و دەربارەیان وتی: "هەرگیز نابێت ئەم وتانە وتەی مرۆڤ بن".

لەپاشان پرۆفیسۆر "دورجاروا" مامۆستای زانستی جیۆلۆجیای دەریاکان دێت، تاکو دەرەنجامەکانی زانستی نوێمان پێ بڵێت دەربارەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾النور/ ٤٠، واتە: (کاروکردەوەیان) وەك ئەوە وایە لە تاریکستانی ناو دەریای شەپۆلاویدا گیریان خواردبێت، شەپۆل بەسەر شەپۆلەوە لەسەریەوە هەور دایگرتبێت، تاریکستانی یەك لەسەر یەك، کاتێك کە دەستی دەربێنێت خەریکە دەستی خۆی نەبینێت، بێگومان ئەوەی خوا نووری پێنەبەخشێت، هەرگیز نووری دەست ناکەوێت.

پرۆفیسۆر "دورجاروا " دەڵێت: "مرۆڤ لە ڕابردوودا بەبێ بەکارهێنانی ئامێرە نوێیەکان نەیتوانیوە بچێتە قوڵایی دەریاکانەوە، لەوێدا لەقوڵایی (٢٠٠٠ مەتر)دا تاریکییەکی تەواوە". ئایەتە پیرۆزەکە دەفەرموێت: ﴿بَحْرٍ لُّجِّيٍّ...﴾. دروست وەك ئەوەی کە دۆزینەوەی نێو قوڵایی دەریاکان وێنەیەکیان پێداوین دەربارەی وتەی خوای مەزن ﴿ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ﴾. زانراوە کە ڕەنگەکانی شەبەنگی ڕووناکی ژمارەیان حەوت ڕەنگە: سوور و پرتەقاڵی و زەرد و سەوز و شین و نیللی و وەنەوشەیی. کاتێك ڕووناکی دەچێتە قوڵایی دەریاکانەوە، ئەم ڕەنگانە یەك لەدوای یەك وندەبن، ونبوونی هەر ڕەنگێك تاریکییەك دەدات .

لەسەرەتاوە ڕەنگی سوور وندەبێت و پاشان پرتەقاڵی و زەرد و دواهەمین ڕەنگ کە وندەبێت ڕەنگی شینە... هەر ڕەنگێك کە وندەبێت بەشێك لەتاریکی دەدات تا دەگاتە تاریکی تەواو.

بەلاَم وتەی خوایی ﴿مَوۡجٌ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٌ﴾ بەشێوەیەکی زانستی سەلمێنراوە کە جیاکەرەوەیەك لەنێوان قوڵایی دەریا و بەشی سەرەوەیدا هەیە، ئەم جیاکەرەوەیەش پرییەتی لە شەپۆل، وەك ئەوەی کۆمەڵە شەپۆلێك لەسەر لێواری بەشە قووڵە تاریکەکەی دەریادا هەیە، ئەمە نابینین و کۆمەڵە شەپۆلێکیش لەسەر ڕووی دەریاکەدا کە ئەمەیان دەبینین وەك ئەوەی شەپۆلێك لەسەری شەپۆلی تر هەبێت... ئەمەش ڕاستییەکی زانستی سەلمێنراوە. لەبەرئەوە پرۆفیسۆر "دورجاروا" لەبارەی ئەم ئایەتانەوە دەڵێت: "نابێت ئەمە زانستی مرۆڤ بێت".

# نهێنی هەورەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ﴾النور/٤٣، واتە: ئایا نابینیت کە بێگومان خوا بە ئارامی و شێنەیی هەورەکان بە ئاسماندا دەبات، دوایی بەیەکەوە پەیوەستیان دەکات، ئەوسا کەڵەکەیان دەکات لەسەریەك، ئینجا دەبینی لە توێی ئەو هەورانەوە کە وەك کێو وان باران و تەرزە دەبارێنێت.

هەوری کەڵەکە بوو (رُکامي) لە پارچەیەکی ئێرە و پارچەیەکی ئەوێ پێکدێت کاتێك هەوایەکی هێدی پاڵیان پێوەدەنێت تاکو وردورد پێکیانەوە دەبەستێت. وتراوە: هەوری کەڵەکەبوو کاتێك دروستدەبێت کە دوو هەور کۆدەبنەوە یان هەورێك بەخێرایی گەشە و گەورە دەبێت، کە دوو هەور کۆدەبنەوە یاخود هەورێك بەخێرایی گەشە دەکات خودکاریانە تەوژمێکی هەوایی لەنێویدا دروستدەبێت، ئەم تەوژمە هەواییە بۆ سەرەوە بەرزدەبێتەوە، کە بۆ سەرەوە بەرزدەبێتەوە وەك مژەرێك کاردەکات، ئەو مژەرەی هەوا لە لاکانەوە بۆ خۆی ڕادەکێشێت و هەورەکان کێشدەکات ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ﴾. لەدوای ئەوەی بەمشێوەیە دروستبوو و هێزی کێشکردنی هەورە دراوسێکانی هەبوو، ئیتر ئەوە پێکهاتنی هەورەکەیە.

کە لەنێو ئەو هەورانەدا دروستبوو و هەورەکانی تری لێ دوورکەوتنەوە، ئـیتر کـاری ڕاکێشـانەکە دەوەسـتێت و شـتێکی زۆر بـەهێز ڕوودەدات: گەشەکردنێکی ستوونی بۆ سەرەوە، ئەم گەشـەکردنەی هـەورەکان لەسـەر یەکتری کەڵەکە دەکات و دەبێتە هەوری کەڵەکە بوو ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا﴾.

## دیاردەکانی دەریا

١. بەربەستی نێوان دەریاکان

٢. شەپۆلە ڕوویی و ناوەکیەکان

ئەم ئایەتە پیرۆزە گرنگترین دیاردەکانی گەردەلول (زریـان)ی دەریـا و شەپۆلەکانی کۆدەکاتەوە، دەفەرموێت: ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾الرحمن/١٩-٢٠، واتـە: ئـاوی دوو دەریـای بـەرەڵا کـردووە و بەیـەك گەیاندووە تێکەڵیش نابن، چونکە لەنێوانیانـدا بەربەسـتێك هەیـە ناهێڵێـت تێکەڵ بن.

هـەروەها پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾الفرقان/٥٣، واتە: هەر ئەو زاتەیـە ئـاوی دوو دەریـا یـان دوو ڕووبـار لـەپاڵ یەکـدا (وەك خۆیـان دەهێڵێتەوە و تێکەڵ نـابن)، ئەمـەیان شـیرین و خـۆش و سـازگارە، ئـەوی تریان تفت و تاڵە، لەنێوانیاندا بەربەست و کۆسپی فەراهەم هێناوە ناهێڵێت تێکەڵ ببن.

ئـەم ئايەتـە گـرنگترين زريانـەكانى دەريـا و شـەپۆلەكانى كـۆكردەوە، ئاشكرايە كە لە زريانـەوە شـەپۆلگەلى بـەرزى و فراوانـى و سـيفەت جيـاواز دەردەچـن، هەنـدێكيان بەشـوێن هەندێكيانـدا دەڕۆن و شـەپۆليش وەك ئەوەيە بەسەريەكدا دەربچن .

شايانى باسە پێغەمبـەر (ﷺ) گـەورە بـوون و ژيـانى لـە سـارا دوور لـە ژينگەى دەريادا بەسەر بردووە، وێـڕاى ئـەوەى كـە هـەرگيز بـە زەرياكانـدا گەشتى نەكردووە تاكو ئەو وەسفە وردەى دياردەكانى دەريا بكات. بۆيـە ئەمە سەلمێنەرى ڕاستيەكە: ئەو وتە و ئايەتانە لەلايەن خواى بەديهێنـەرى ئاسمانەكان و زەويەوە بۆ محمد (ﷺ) دابەزێنراون.

ئەم ئايەتە پيرۆزانە ئاماژە بە هەندێك ڕاستى زانستى دەكەن كە تا ئـەم دواييانەش زانست ئاشكراى نەكردبوون، ئەمەش يەكێكى تـرە لـە ئيعجـاز و دەرئاساكانى قورئانى پيرۆز .

## سىٚ جۆر شەپۆلى دەرياكان هەن:

- شەپۆلى ڕوويى كە بەهۆى پاڵى (با) و شەپۆلەكانەوە دروست دەبن.
- شەپۆلەكانى هەڵكشان و داكشان بەهۆى كێشكردنى مانگەوە.
- ئەو شەپۆلانەى لە قولاييە زۆرەكانى زەرياكاندا دروست دەبن زۆر توند و بەهێزن و بەخێرايى فرۆكەكان دەجولێن، ئـەم شـەپۆلانە لـەئاكامى جوڵـەى زەمينلەرزەيى بنكى زەرياكانەوە يان داڕوخانى بارستەيەك لە تەنيشتەكانى زەرياكاندا بەرهەم دێن، يـاخود ئـەو جوڵـە زۆر گرنگـەى كـە لـە زەرياكانـدا دروسـتدەبێت و بـە (ڕووبـارى زەريـا) ناودەبرێـت بـەهۆى جيـاوازى پلـەى گەرمى لە جەمسەركانى زەوى و هێڵى كەمەرەييدا جوڵەيەك لە دوو ئاسـتى

سـتوونی ئـاوی زەریـادا دروسـتدەبێت و شـەپۆلێك ئـاو (ی سـارد) لەجەمسـەرەکانەوە بـەرەو هێڵـی کەمـەرەیی و شـەپۆلێکیش لەسـەروو ئەمانـەوە بەپێچـەوانە وە لـەهێڵی کەمەرەییـەوە بـەرەو جەمسـەرەکان دەجوڵێن، بەوە (ڕووباری زەریایی) دروستدەبێت.

قورئانی پیرۆزیش ئاماژە دەدات و دەفەرموێت:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ﴾النور/٤٣، واتە: ئایا نابینیت کە بێگومـان خوا بە ئارامی و شێنەیی هەورەکان بە ئاسمانـدا دەبـات، دوایـی بەیەکـەوە پەیوەستیان دەکات، ئەوسا کەڵەکەیان دەکات لەسەر یەك، ئینجا دەبینیت لەتوێی ئەو هەورانەوە کە وەکو کێو وەهان بـاران و تـەرزە دەبارێنێـت، لـە سوودی ئەو بارانە بەهەر کەس خوا بیەوێت، خێر و بەرەکەت دەبەخشـێت، هەرکەسیش کە بیەوێت لێی دوور دەخاتەوە (هەورە بروسـکەکان ئەوەنـدە بەهێزن) خەریکە بریسکەیان بینایی چاوان بەرێت.

لـەو زانیارییانـەی تـا ئـەم دواییانـە زانسـت پـەیی پێنـەبردبوو، بـوونی ڕووبارو تەوژمی دەریایین کە لە قوڵایی دەریاکاندا دەجوڵێن و ئاوی شـیرین و سازگار بـۆ مـاوەی دوور هەڵدەگرن... لەوانـەش نـامۆتر بـوونی ڕووبـاری دەریایین کە خوێدارییان کەمترە و پلەی گەرمیشیان هێنـدە کەمـە دەگاتـە نزیکی بەستن، ئەم ڕووبارانە لە قوڵایی دەریاکان بە پێچەوانەی تەوژمەکانی سـەر ڕووی دەریاکـە دەجـوڵێن. ئـەم حاڵەتـە لـەژێر تـەوژمی کەنـداودا دۆزرایـەوە و دواتـر بـەناوی دۆزەرەکەیـەوە نـاونرا تـەوژمی (Cromwell) لەساڵی (١٩٥١)دا کاتێك تۆڕی قوڵی بۆ ماسی گرتنی بنی دەریا بـەکارهێنا،

بینی بەشەکانی تۆڕەکە لەخوارەوە بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانەی تەوژمی سەرەوەی ئاوی دەریا دەجولێن.

سەیرترین دوو تەوژمی دەریایی لەیەك جێگادا یەك لەسەر ئەوی تر، ئەوەیە کە لە ناوچەی نزیك (جبل طارق) هەیە، لە خالی بەیەککگەیشتنی دەریای ناوەڕاست بە زەریای ئەتڵەسی، لە ڕۆژانی زستاندا و لەئاکامی زیادبوونی تێکڕای بەهەلمبوونی ئاو لەدەریای ناوەڕاست لێکچوی ئەوەی لە زەریای ئەتڵەسیدا بەهەلمبوون ڕوودەدات، ئاوی دەریا (کە سوێرییەکەی زیاترە) دەچێتە قولایی دەریاوە و تەوژمێکی ڕووەو زەریا دروست دەکات. لەهەمان کاتیشدا ئاوی ڕوویی کە سوێری کەمترە و پلەی گەرمی بەرزترە (لە زەریای ئەتڵەسیدا) بە ئاڕاستەی دەریای ناوەڕاست دەجولێت، تەوژمێکی ڕوویی لەسەروو تەوژمەکەی پێشووەوە و پێچەوانەی ئاڕاستەوە دروستدەکات.

ئەمەیە زانست دڵنیایی لەبارەوە دەدات، لەکاتێکدا زۆر بەر لە زانست قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە.

# دەریای گەرمکراو

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ﴾طور/٦.

(سجر) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (گەرمکردنەوە لەسەر شتێك) دێت، خوای گەورە سوێند بە دەریایەکی گەرمکراو دەخوات.

تا ماوەیەك بەر لە ئێستا خەڵکی لە مانای دەریای گەرمکراو تێ نەدەگەیشتن: بەڵام چواردە سەدە پێشتر خوای مەزن سوێندی بە دەریای گەرمکراو خواردوە. دەبێت ئەو دەریایە بە چی گەرم کرابێت؟

لەم دوادواییانەدا زاناکان بۆیان دەرکەوت کە لە بنی دەریاکاندا بەردی زۆر گەرم هەیە و هەموو بنی دەریاکانی گرتووەتەوە. ئەو بەردانە زۆر گەرمن، لەوەش نامۆتر ئەوەیە حاڵەتێکی هاوسەنگی هەیە لە نێوان گەرمی ئەو بەردانە و ئاوەکەدا بەشێوەیەك کە نە ساردی ئاوەکە بەردەکان ساردەکاتەوە و نە گەرمی بەردەکانیش ئاوەکە گەرم دەکات و دەکوڵێنێت.

جێی باسە هەندێك جار ئەو بەردە زۆر گەرمانە بەشێوەی گڕکان دەردەپەڕنە دەرەوە بۆ سەر ڕووی ئاوی دەریا و دوورگەی وەك دوورگەی (هاوای) دروست دەکەن.

ئەمە و لە بنی دەریاکاندا هێڵی گڕکانی دووروودرێژ هەن کە بەشێوەیەکی بەردەوام گڕکانی لێوە دێتە دەرەوە.

# نهێنی هەڵقوڵینی ئاو لەبەردەوە!

چـەند جـار ئـەم ئایەتـەمان خوێندووەتـەوە و بیرمـان لـە ماناکـەی نەکردووەتەوە تاکو سەردەمی نویٚ دێت و نهێنی ئیعجازی ئایەتەکەمان بۆ دەردەخات، ئەوەش بۆ ئەوەی بۆمانی دووپـات بکاتـەوە کـە ئـەم قورئانـە هەر دەبێت لەلایەن زاتی پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤ نێردرابێتە خوارەوە.

پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ البقرة/٧٤، واتـە: پاشـان لـەوەودوا دڵـەکانتان ڕەق بـوون، (ئـەی جولەکەکان) هەروەك بەرد، بەڵکو ڕەقتریش (چونکە) بەڕاستی بـەرد هەیـە ڕووبـاری لـیٚ هەڵـدەقوڵێت، هەشـیانە لـەت لـەت دەبێـت و ئـاوی لـیٚ دێتـە دەرەوە، هەشیانە لەترسی خوا لە لوتکەی شاخەکان بەردەبێتەوە، خـواش بێئاگا نییە لەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

توێژینەوە جیۆلۆجیە نوێیەکان سەلماندویانە کە بەرد کاریگەر دەبێت و کارلێك دەکات، بەردی وەها هەیە ئاوی زۆری لێوە هەڵـدەقوڵێت و ڕێـڕەوی زۆر دروست دەکات، هەیشـە لـەت لـەت دەبێـت و ئـاوی لـیٚ دێتـە دەرەوە. ئەمە وێڕای ئاوی ژێر زەوی کە نـوقمی تـوێکڵی زەوی دەبێـت و دواجـار لـە کەلێنەکانی تاوێر و بەردەکانەوە ڕیٚ دەکات.

کاتێك پەستانی سەری زیاد دەکات بەشێوەی ئاوی هەڵقوڵاوی نێوان تاوێرەکانەوە دەردەچێت بەجۆرێك کە دەکرێت ڕووبار و سەرچاوە پێکبێنێت.

## ئاوی ژێر زەوی

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بە ئاوی ژێر زەوی داوە لەگەڵ چۆنیەتی پێکهاتن و دروستبوونی لەنێو زەویدا، وەك دەفەرموێت:

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ﴾

المؤمنون/١٨، واتە: هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بە ئەندازە و نەخشەیەکی دیاریکراو بارانمان باراندووە و ئینجا لە ناخی زەویدا جێگیرمان کردووە، بێگومان ئێمە بەجۆرەها شێوە دەتوانین ئەو ئاوە لەناوبەرین و ئەو سەرچاوانە وشك بکەین.

تیۆرە نوێیەکان دەڵێن: "ئاوی ژێر زەوی لە ئاوی سەر زەوییەوە کە لە بارانەوە دێن، پێکدێن. ئاوی سەرزەوی ڕۆدەچێتە نێو زەوی و لەوێدا دەپارێزرێت".

تا کاتێکی نزیك لە ئێستا زانایان لەو باوەڕەدا بوون لەنێوان ئاوی ژێر زەوی و سەر زەویدا پەیوەندییەك نییە، بەڵام ئەوە قورئانی پیرۆزە کە بەر لە چەندین سەدە ئەم ڕاستییە تۆمار دەکات.

ڕابمێنە لە وتەی پەروەردگار: ﴿فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ﴾، واتە: لەزەویدا پاراستومانە و تێیدا خەزنمان کردووە.

# نـاوچەی ڕێژگە و بەربەستی نێوان دوو دەریا

زانستی دەریاکان پەیوەندی بە سەرجەم دیاردە جیاوازەکانی جیهانی دەریاکانـەوە هەیـە... وێـڕای ئـەوەی ئـەم زانسـتە لـە زانسـتە نوێیـەکان دەژمێردرێ، بەڵام قورئانی پـیرۆز زۆرێك لـە ڕاسـتی بـەنرخی لـەخۆگرتووە دەربـارەی دیـاردە دەریاییـەکان کـە تازەبـەتازە بـەهۆی ئـامێری نـوێی پێشکەوتووەوە دۆزراونەتەوە.

خـوای پـەروەردگار وەسـفی سیسـتمی ڕێژگـە (المصـب)ی کـردووە و دەفـــەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ الفرقان/٥٣، واتە: هەر ئەو زاتەیە ئاوی دوو دەریا یا دوو ڕووبـار لـەپاڵ یەکدا (وەك خۆیـان دەهێڵێتـەوە) ئەمـەیان شـیرین و سازگارە، ئەوی تریان خوێیـەکی نـاخۆش و تـاڵ، لەنێوانیانـدا بەربەسـت و کۆسپی فەراهەم هێناوە.

ئـەوەی لـە ئایەتەکەدایـە ڕوونکردنەوەیەکـە سـەبارەت بـە تێکـەڵبوونی ئاوی شیرین بە ئاوی سوێری دەریا لەگەڵ بـوونی بەربەسـتێك لەنێوانیانـدا. ناوچەی تێکەڵبوونیشیان بەهەنـدێك پێوەنـد پـارێزراوە، لـەوەی کـە بچێتە ژوورەوە بۆی یان لێی دەربچێ. هەر ئەمەیە زانستی نـوێ سـەلماندوویەتی. لێرەدا هەندێك لە بەڵگەکان باسدەکەین.

قورئانی پیرۆز باسی لە بوونی بەربەستی هاوشێوە کردووە لە دەریا خوێدارەکان خۆیاندا، وەک دەفەرموێت: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ۝١٩ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾الرحمن/١٩–٢٠، واتە: دوو دەریای لەپاڵ یەکدا داناوە و تێکەڵیش نابن، لەنێوانیاندا بەربەستێك هەیە ناهێڵێت تێکەڵ ببن. یان دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾النمل/٦١، واتە: لەنێوان دوو دەریاکەشدا بەربەستێکی بەرپاکردووە.

ئەم بەربەستانە وەک سنووری ئاویی وەهان لەنێوان زەریای ئەتڵەسی و دەریای ناوەڕاستدا، لەنێوان دەریای سوور و کەنداوی عەدەن و جگە لەوانەش لەنێوان هەندێك لە دەریاکانی جیهاندا.

ئەم دوو دیاردەیە لە قورئانی پیرۆزدا بەڕوونی باسکراوە.

## ناوچەی ڕێژگە (پێکگەیشتنی ئاوی دوو دەریا):

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾

لە لێکۆڵینەوەی دۆزینەوە نوێیەکانی ئەم بوارە، دەردەکەوێت:

١. ئاوەکان دابەشدەکرێن بۆسێ بەش:

أ– ئاوی ڕووبارەکان کە شیرین و سازگارن.

ب– ئاوی دەریاکان کە خوێدارن.

ج– ئاو لە ناوچەی ڕێژگەدا کە تێکەڵێکە لە خوێداری و شیرین، ئەمەش ناوچەیەکە ڕووبار و دەریاکان لەیەکتر جیادەکاتەوە، لەنێوانیاندا بەپێی هەڵکشان و داکشان (المد والجزر) جوڵاوە، چەند لە دەریاکە نزیك

ببێتـەوە خوێـداری زیاددەکـات و چـەندیش لـە ڕووبارەکـە نزیـك ببێتـەوە شیرینی و سازگاریی زیاددەکات.

٢. بوونی بەربەستێکی ئاوی کە دەوری ئـەم ناوچـەی ڕێژگەیـە دەدات و تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی ئەم ناوچەیە دەپارێزێت.

٣. ئاوی ڕووبار و ئاوی دەریا ڕاسـتەوخۆ بەیـەك ناگـەن، لەگـەڵ بـوونی فاکتەری بەهێزیش بۆ تێکەڵبوون وەك هەڵکشـان و داکشـان و گـەردەلول و لافاوەکـان، چـونکە ئـەو بەربەسـتەی دەوری ناوچـەی ڕێژگـە دەدات بـە بەردەوامی لێکیان جیادەکاتەوە.

٤. تێکـــەڵبوون بـــە هێواشـــی ڕوودەدات، لەگـــەڵ بـــوونی ناوچـــە جیاکەرەوەکە و بەربەستە ئاوییەکەی دەوری دەدات.

٥. بارستە ئاوییە سیانیەکە لەسوێری و سازگارییدا دەگۆڕێن، هـەروەها ئەو زیندەوەرانەشی *تیایاندان بەمجۆرە پۆلێن دەکرێن:*

أ- زۆرینەی زیندەوەرەکان لە ژینگەکەی خۆیاندا نەبێت نـاتوانن بـژین، هەنـدێکیان لـە هــەموو ژینگەیەکـدا دەژیـن، وەك ماسـی سـەلەمۆن و مارماسیەکانی دەریا.

ب- ناوچەی ڕێژگە کۆمەڵێکی زۆر زیندەوەری تێدا دەژی کە ئەگەر لێی دەربچن دەمرن. کۆمەڵێك زیندەوەرەی تر کە لە ڕووبار و دەریاکاندا دەژین ئەگەر بچنە ئەم ناوچەیەوە بەهۆی جیاوازی پەستانەوە دەمرن.

ئەم سیستمە خوداییە داهێنەرانەیە، خوای گەورە بۆ پاراسـتنی بارسـتە ئاوییەکانی داناوە کە دراوسێن و تێکەڵ نابن. ئێمە توانامان نییە بە چاوی ئاسایی ئەم بەربەسـتانە ببینـین، بـەڵام تازەبەتازە مانگـە دەسـتکردەکان وێنەی ڕۆشنمان دەدەنێ کە سنووری سێ بارستە ئاوییەکە دیاری دەکەن.

## بەربەستی نێوان دوو دەریاكە:

لە باسكردنی قورئانی پیرۆزدا دەربارەی بەربەستی نێوان دوو دەریاكە نهێنییەك لە نهێنیەكانی ئیعجازی قورئانیی هەیە، ئەویش لـەو ئایەتـەدا كـە دەفـــــەرموێت: ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾الـــــرحمن/١٩-٢٢، یـــــان دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾النمل/٦١.

ئـــەم ئایەتانـــە وەســـفێكی وردی دەریـــا ســـوێرەكانیان كـــردووە، بەڵگەكانیشمان ئەمانەن:

١. ئایەتەكـە دەســتەواژەی (البحــرین)ی بــەكارهێناوە، وەك بەڵگــەی سوێریی هەردوو دەریاكە.

٢. دەریخســتووە كــە لــەو دوو جــۆر دەریایــە مــرواری و مــەرجان دەردەهێنرێت، كە هەردووكیان تەنها لە دەریا سوێرەكاندا هەن.

كەسـێك كـە لـە دەقـە قورئانیەكـە ورد دەبێتــەوە دەبینێـت دەریـا سوێرەكان لەگەڵ یەكتریدا جیاوازن، سەرەڕای یەكگرتنیان لـەو وەسفانەدا كە بەچاو هەستیان پێدەكرێت (وەك خوێـداری، شـینی، خـاوەن شـەپۆل و گـەردەلول...). ئایـا ئـەم دەریایانـە چـۆن جیـاواز دەبـن لەكاتێكـدا كـە بەیەكتری دەگەن و هیچ جیاكەرەوەیەكی بینراو لەنێوانیاندا نییە؟!

لە وتەی خواییدا ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾، (مَرَج): تێكەڵبوون یـان هـاتن و چوون و لادانـە. ئەوكەسـەی لـە ئایەتەكـە وردەبێتـەوە بـەجۆرێك وێنـای دەكات كە تێكەڵبوونی ئەم دوو دەریایە وادەكات هەر دەریایـەك خاسـیەتە جیاكەرەوەكانی خـۆی لەدەسـت بـدات، بـەڵام خـوای گـەورە دەفـەرموێت:

﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾، واتە بەربەستێك لەنێوانیاندا هەیە رێگا لە هەریەکەیان دەگرێت دەستدرێژی بکاتە سەر ئەوی تر.

لەساڵی (١٩٤٢) بۆ یەکەمجار لە کتێبی زانستە نوێیەکاندا وەڵامی ئەو پرسیارە دەرکەوت کە زانایانی سەرسام کردبوو، ئەویش: بۆچی دەریاکان تێکەڵ و چونیەك نابن لەگەڵ بوونی فاکتەرەکانی هەڵکشان و داکشان و گەردەلول و شەپۆل و تەوژمەکانیشدا؟

وەڵامەکەش ئەوەیە کۆمەڵێك خاسیەتی ئاوی هەیە کە دەریا پێککەیشتوەکان لێك جیادەکاتەوە و پارێزگاری خاسیەتە جیاکەرەوەکانی هەر دەریایەك دەکەن، تێکەڵبوونی ئاوی دەریاکان زۆر بەهێواشی دەبێت بەنێو ئەم بەربەستانەدا، ئەو ئاوەش کە بە بەربەستەکەدا تێپەڕیوە دەگۆڕێت، وەك خاسیەتەکانی ئەو دەریایەی کە تێی چووە، بەمەش هەر دەریایەك پارێزگاریی خاسیەتەکانی و سنوورەکەی خۆی دەکات بەهۆی بوونی ئەو بەربەستە ئاویانەوە کە لەنێوان دەریاکاندا هەیە.

دواجار مرۆڤ توانی وێنەی بەربەستە جوڵاو و پێچاوپێچەکانی نێوان دەریا سوێرەکان لەڕێی وێنەگرتنی گەرمییەوە و بە مانگە دەستکردەکان بگرێت.

لەو بارستە ئاوی و دەریا بەیەککەیشتوانەی زانایان لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کردووە، ناوچەی پێککەیشتنی ئاوی دەریای سپی ناوەڕاستی گەرم و خوێدارە لەگەڵ ئاوی زەریای ئەتڵەسی سارد و کەمتر خوێدار.

لەدوای هەموو ئەوانەوە پرسیار دەکەین: ئایا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو وێستگە دەریایی و ئامێرانەی شیکردنەوەی بارستە ئاویی و توانایی بەدواداچوونی جوڵەی بارستە ئاویی جۆراوجۆری هەبووە؟ ئایا پێغەمبەر(ﷺ) ڕووپێوی گشتی کردووە لەکاتێکدا هەرگیز بە دەریادا تێپەڕ

نەبووە؟ بەڵکو لە سەردەمێکدا ژیاوە کە ئەفسانە باڵادەست بووە بەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤدا، بەتایبەت لە مەیدانی زانیاری دەربارەی دەریاکاندا.

بۆیە هیچ نامێنێتەوە ئەوە نەبێت بڵێین: ئەم وتانە لەلایەن خوایەکی کارزان و زانا بە هەموو بوون و ژیانەوە دابەزیونەتە خوارەوە بۆ محمد(ﷺ) و هەموو مرۆڤایەتی.

# ( با ) و شەپۆلەكانی دەریا

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾يـونس/٢٢، واتـه: (ئـەی هاوەڵگەران) خوا ئەو زاتەیە لە وشكانی و دەریـادا هاتوچۆتان پێدەكات، هـەتا ئـەو كاتـەی لـە كەشتییەكاندا دەبـن و دەیانگوێزنـەوە بـەهۆی بـا و شەماڵێكی پاك و ئارامەوە و هەموان پێـی دڵخۆشـن، ئـەوە بایـەكی تونـد و بەهێز و سـەخت بـەرەو كەشتییەكە بێـت و هـەڵبكات، لەهـەموو لایەكـەوە شـەپۆل بۆیـان بێـت، ئـیتر وابـزانن كـە دەورە دراون و (ڕزگاربوونیـان ئەستەمە، ئا لەوكاتەدا خەڵكەكە بە سۆزەوە) هانا و هاوار بۆ خـوا دەبـەن، دڵنیـان خـوا نـەبێت كـەس ناتوانێـت فریایـان بكـەوێت، بۆیـە بـە سـۆزەوە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر لەم بەڵایە، لەم تەنگانەیـە، ڕزگارمـان بكـەیت، بەڕاستی دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانتەوە.

زانستی نـوێ سـەلماندوویتی شـەپۆلەكانی دەریـا جوڵەگـەلی ستوونیان هەیە كـە كاردەكەنـە سـەر جوڵـەی ئاوەكـە بـەهۆی هـەڵكردنی بـا لەسـەر دەریاكە بە ئاڕاستەیەكی دیاریكراودا. هـەروەها شـەپۆلەكانی هەڵكشـان و داكشـان و ئـەو شـەپۆلانەش هـەن كـە زەمینلـەرزەی دەریاكـان دروستیان

دەکەن. شەپۆلەکە بەدرێژایی ڕووی دەریاکە بەخێرایی بڵاودەبێتەوە، یان دەگوێزرێتەوە، لەکاتێکدا کە ئاوی دەریاکە بە ستوونی لە جێگای تایبەتدا و بە فراوانی تایبەت بەرزدەبێتەوە، ژمارەی ئەو بەرزیانەش لە هەر ساتێکدا جیاوازن. لەبەرئەوەیە دەبینین هەر شەپۆلێك خێرایی بڵاوبوونەوە و فراوانی و لەرەلەری خۆیی هەیە، دووریی نێوان هەر دوو سەر یان بنی شەپۆل پێیدەوترێت درێژی شەپۆل.

سەرجەم ئەم خاسیەتانە پەیوەندیان بە با و قوڵی ئاوەوە هەیە، جۆرێك لە شەپۆلی دەریا هەیە دەکرێت وەك نیشانەیەك بۆ نزیکبوونەوەی زریانی دەریا تەماشا بکرێت.

ئەو ئاوەی جەستەی شەپۆلەکە پێکدێنێت لەگەڵیدا بەدرێژایی دەریاکە ناجوڵێت، بەڵکو هەر بەشێکی لە ڕێڕەوێکی نیمچە بازنەییدا، ئەستون لەسەر هێڵی جوڵەی شەپۆلەکە دەجوڵێت، لەکۆتایی جوڵە بازنەییەکەیدا بەنزیکی دەگەڕێتەوە بۆ جێگا بنەڕەتییەکەی، بەوەش لادانی زۆر کەم و بچوك لە ئاوەکەدا بە ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلەکە ڕوودەدات.

ڕەنگە (با) جێگیربێت و بوەستێت و دەریاش هێمن و ئارام بێت، بەتایبەت لە ناوچەکانی هێڵی یەکسانی زەوی یاخود ناوچە خولگەییەکان کە پەستانی بەرزی هەوا نامێنێت، بەوەش شەپۆل نامێنێت و کەشتییە چارۆکەدارەکان لەوێدا ناجوڵێن.

سەرەڕای ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ناوچانەی نەبینیوە، بەڵام قورئانی پیرۆز باس و وەسفی ئەو حاڵەتانەی کردووە کە لەپانتایی زەریادا ڕوودەدەن: ﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِ﴾ الشـــوری/٣٣، واتە: خۆنەگەر (خوا) بیەوێت با دەوەستێنێت و لەسەر پشتی دەریاکە دەوەستن و لەکار دەکەون.

ئـــەو شـــەپۆلانەی هـــاوڕێی زریانـــە ناوچـــەییەکانی کـــەنارەکانن، بەرزبوونـــەوەی ئاسـتی ئـاوی گشـتی هاوکاتیـەتی، ئـەو بەرزبوونەوەیـە ناودەبرێت بە کشانی زریانی (المدّ العاصفي).

زۆرجـار بەرزبوونـەوەی ئـاو کتـوپڕ دەبێت لەنێوەنـدی پشـێوی دەریـا (گـەرداو)دا، ڕەنگـە شـەپۆلەکان بـە یـەکجاری نـەمێنن گـەر دژە بایـەك ڕووبـەڕووی ببێتـەوە، یـاخود پێدەچـێت پاڵپشـتی بکـات، فراوانییەکـەی زیاددەکات ئەگەر با بە ئاڕاستەی جوڵەی شـەپۆلەکان هـەڵبکات. هـەروەها (بـا) دەتوانێـت شـەپۆلەکان پێچـەوانە بکاتـەوە (یـاخود ئاڕاسـتەی جوڵـە بگۆڕێت) گەر بە لارییەکی ڕێژەیی هەڵیکرد.

# ترس و باران

یەکـەمین جـەنگ لـەنێوان بێبـاوەڕ و موسـڵماناندا لـە جـەنگی بـەدری گەورەدا بوو. موسڵمانان ژمارەیان کەم بوو، دەرچوون و خواستی کاروانی بێباوەڕانیان هەبوو. جەنگەکە شتی سەیری تێدا بوو، موسڵمانان لەبەردەم سوپایەکی گەورە و بەهێزدا بـوون، ژمارەیان چەند هێنـدی ئـەوان بـوو... جەنگەکە بەرپا دەبێت و بێباوەڕانیش متمانەی تەواویان بـە سـەرکەوتنیان هەیە. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولاً﴾الأنفال/٤٤، واتـە: کـاتێکیش بە یەکگەیشتن لە گۆڕەپانی جەنگدا لەبەرچاوی ئێوە، خوا ئەوانی بـە کـەم نیشـان دەدان و ژمـارەی ئێوەشـی لەبەرچـاوی ئـەوان بـە کـەم دەنوانـدن، بۆئەوەی هەر ئەوە پێشبێت کە خوا بڕیاری لەسەر داوە.

بێباوەڕان متمانەیان بە سەرکەوتن هەبوو. موسڵمانان کـەم بـوون، سـێ سەد یان کەمێك زیاتر بوون، بـەڵام بێبـاوەڕان دوو هـەزار بـوون و دووسـەد سوارچاکیان لەگەڵدا بوو کە هەر سوارێك بەرامبەرە بە دە جـەنگاوەر بـوو. کاتێك بێباوەڕان تەماشای موسڵمانانیان دەکرد کە ژمارەیان لەبەرچـاویاندا کـەم بـوو و ژمـارەی خۆیـان زۆربـوو، دڵنیـابوون سـەرکەوتن بـۆ خۆیانـە، ویستیان سەرکەوتنێك لەبواری عەقیدەدا بۆ خۆیان مسۆگەر و تۆمار بکەن، هاوڕێ لەگەڵ سەرکەوتنی بواری جەنگەکە، بۆیە دەردەچوون و دەیانوت: پەروەردگارا! کێ لەسەر هەقە سەرکەوتووی بکەیت... پێغەمبەریش (ﷺ)

داوای پشت و پەنا و یارمەتی لە خوای گەورە کرد. خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ، وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾الأنفال/٩-١٠، واتە: یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە و داوای یارمەتیتان لێدەکرد، خوایش خێرا هات بە هاناتانەوە و فەرمووی بەڕاستی من بە هەزار فریشتەی تر یارمەتی و کۆمەکیتان دەکەم بەشوێن ئەوانی تردا. ئەم یارمەتیەش جگە لە مژدەیەکی خوایی شتێکی تر نەبوو، تا دڵەکانیشتان ئارام بگرێت و دڵنیا بن بەو یارمەتیە، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لەلایەن خواوە نەبێت نییە، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی باڵادەست و دانایە.

کاتێك موسڵمانان سەربازی خوایی لەنێو خۆیاندا دەبینن، دڵەکانیان ئارام دەبێت، سەرکەوتنیش لەلای خواوەیە، نەك لەلایەن فریشتەکان یان لەلای مرۆڤەکانەوە.

باوێشك کە خوای گەورە کردویەتیە بەخششێك بۆ خەڵك، کاتێك دەخەون هێز بۆ جەستەیان دەگەڕێتەوە لەدوای شەکەت بوون و ناڕەحەتی. خوای گەورە دەیەوێت سوننەت بۆ موسڵمانانی ترساو لە شەوی جەنگدا تێپەڕێنێت، وەنەوزێك هەموویانی داگرت، لەیەك ساتدا، هەریەکەیان خەوی لێکەوت، لەگەڵ ئەو وەنەوزەدا کە سەرجەمیانی گرتەوە خەوێکی قووڵ و ئارامیی بەهێز دایگرتن... هەندێك لە موسڵمانان خەویان بینی و لەشیان گران بوو و لە بەیانیدا لەخەو هەستان، شەیتان هات و ئامۆژگاری کردن و وتی: چۆن دەچنە جەنگەوە لەکاتێکدا لەشتان گرانە؟! چۆن خوای پەروەردگار فێڵی شەیتان ڕەتدەکاتەوە و بارانی لە ئاسمانەوە

باراند تاكو موسڵمانانی پـێ پـاك بكاتـەوە و پـیس و پـۆخڵی شـەیتانیان لێ دووردەخاتەوە!

پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ﴾الأنفال/١١، واتە: ئەو مژدە و ئـارامی دڵـە كاتێك بـوو كـە خوای گەورە بە وەنەوز دایگـرتن، بۆئـەوەی هێمنیـەك بێـت بۆتـان لەلایـەن خۆیەوە و ئاوێكیشی لە ئاسمانەوە بەسـەرتاندا بارانـد بۆئـەوەی خاوێنتـان بكاتەوە پێی و پۆخڵی شەیتانتان لێ دووربخاتەوە (تا لەڕووی جەستە و دڵ و دەروونەوە خاوێن بن) و دڵەكانتان بەهێز و دامەزراو بكات و بیانبەسـتێت بەخواوە و بەو ئاوە پێیەكانیشتان جێگیر و قایم بكات.

پزیشكەكان دەڵـێن لـەكاتی ترسـدا ماددەیـەك لەخوێنـدا دەردەدرێـت و بـەوەش پەلـەكان دەلـەرزن و جـێگیر نـابن. لـە هۆكارەكـانی جێگیركردنـی پەلــەكان، كەمكردنــەوەی ئــەم ماددەیەیــە ئــەویش بــە پرژانــدنی ئــاو بەسـەریاندا. هـەروەها دابەزانـدنی ئـاو لـەو هۆكـارە ماددیانەیـە كـە خـوای گەورە كردوویەتە هۆی جێگیر و قایم كردنـی پێیـەكان. بە كەمكردنـەوەی ئەم ماددەیە لەخوێندا، لەگەڵ جێگیركردنی ئەو زەوییـەی جـەنگاوەران بـە هاوڕێیـەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەریدا دەڕۆن، لـەژێر پێیەكانیانـدا جـێگیر و چەسپاوە، چونكە ئەگەر خۆڵ و خاك تەڕ بوو، زیـاتر و زیـاتر یەكـدەگرن و پێكەوە پەیوەست دەبن و ڕێبواریش بە ورەبەرزی و جێگیریـەوە بەسـەریدا دەڕوات و پێیەكان ڕۆناچن... دابارینی باران بەسـەر بێباوەڕانـدا لەجوڵـەی خستن، لەپاشان دەبینی لـەكاتی بەیـەك گەیشـتنی دوو سـوپاكەدا ئـەنجام چۆن دەبێت؟

لەدوای جەنگ و دوای بەیەگەیشتنی دوو پۆلەکە، پۆلی فریشتە لەگەڵ باوەڕداراندا، ژمارەی باوەڕداران لەچاوی بێباوەڕاندا (زۆر زیاتر لەسەرەتا، بەر لە بەشداری فریشتە و یارمەتیی خوا) دەبینران... لەپاش ئەوەی سەرەتا کەمبوون، بەڵام ئەوکاتە بە چاوی بینایی خۆیان باوەڕدارانیان بە دوو هێند دەبینی.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ﴾ آل عمران/١٣، واتە: (ئەی محمد (ﷺ) بەو خەڵکە بڵێ) بێگومان لەو دوو دەستەیەی ە لە (جەنگی بەدردا) ڕووبەڕووی یەکتر وەستان نیشانە و پەندێکی گەورە بوو بۆتان، دەستەیەکیان لەپێناوی خوادا دەجەنگان، دەستەکەی تریان بێباوەڕبوون، باوەڕداران لەبەرچاوی ئەواندا دوو ئەوەندەیان دەنواند (لە گۆڕەپانی جەنگدا بەچاوی بینایی و بینین).

# سەرچاوەکان

١. تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین
٢. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، عبالرحيم الماردينى
٣. موسوعة الإعجاز العلمـي في القـرآن الكـريم و السـنة المطهـرة، يوسـف الحاج أحمد
٤. الموسوعة الذهبية في إعجاز القرآن الكـريم و السـنة المطهـرة، د.أحمـد مصطفى متولى
٥. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن و السنة، م.نايف منير
٦. موسوعة الإعجاز القرآنى في العلوم والطب و الفلك، د.نادية طيارة
٧. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن، هيثم جمعة بلال
٨. الموسوعة الكونية الكبرى/آيات الله في خلق الأرض و تـأمين معايشـها، د.ماهر أحمد الصّوفي
٩. حقائق العلم الحديث (١-١٠)، عبدالرحمن العصافي
١٠. الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، محمد سامي محمد علي
١١. الإعجاز العلمى في أسرار القرآن الكريم و السنة النبوية، محمد حسـني يوسف
١٢. الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، د.عبدالقادر محمد منصور
١٣. معجزة القرآن، نعمت صدقي
١٤. الأدلة المادية على وجود الله، شيخ محمد متولى الشعراوي
١٥. الإعجاز العلمي في السماء و الأرض، الشيخ أسامة نعيم
١٦. من آيات الإعجاز العلمي (الأرض في القـرآن الكـريم)، د.زغلـول راغـب محمد النجار

١٧. من علوم الأرض القرآنية، د.عدنان الشريف
١٨. المفهوم العلمي للجبال في القرآن الكريم، د.زغلول النجار
١٩. توحيد الخالق/ الجزء الأول، عبدالمجيد الزندانى
٢١. وغدا عصر الإيمان، عبدالمجيد الزندانى
٢٢. العلم طريق الإيمان، عبدالمجيد الزندانى
٢٣. مجلة الإعجاز، عدد ٣، ٨
٢٤. چەند پێگەیەکی ئینتەرنێت، بەتایبەت هەردوو پێگەی ئەلیکترۆنی:
www.55a.com
www.kaheel7.com